# پایزە برا

## بەرگی دووەم

نوسینی
مەلا ئەحمەدی شەریعە

پێداچوونەوەی
ئیکرام کەریم



ناوی کتێب: پایزەبرا ـ بەرگی دووەم

ئامادەکار: مەلا ئەحمەدی شەریعە

چاپ: چاپی یەکەم

چاپخانە: چاپخانەی ڕێ نوێ

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتی یەکان ژمارەی (٢١٢٦) ساڵی ٢٠١٣ ی پێدراوە.

**تێبینی: هەر خوێنەرێك چیرۆکێکی واقعی ڕاست و دروستی لایە ئەتوانێ بۆمان بنێرێ لە ڕێگای (کتێبخانەی تیشك) ەوە.**

## بەناوی خوای داناو زاناوە

## پێشەکیەك بە قەڵەمی (مامۆستا ئیکرام کەریم)

خوێنەرانی بەڕێز! مامۆستا مەلا ئەحمەدی شەریعە ڕوونووسی ئەم بەرگەی کتێبەکەی بۆ ناردم، تا هەم پێشەکییەکی بۆ بنووسم وهەم تێبینی خۆشمی بۆ بنێرم، منیش بە سوپاسەوە وامکرد کە ئەو داوای کردبوو..

ئەم کتێبە بەرگی دووهەمی کتێبی (پایزە برا)یە، کە نووسەری بەڕێز گەڕاوە بە خەمەوە ئەو ڕووداوە دانسقەو پڕپەندانەی بۆ کۆکردووینەتەوە کە لە ناو کۆدڵی کوردەواریدا ڕوویانداوە.

کۆدڵی کوردەواری لە هەموو ناوچەکانیدا دەیان و بگرە سەدان ڕووداوو چیرۆکی لەم چەشنەیان تێدایەو چاوەڕوانی پیاوێکی خەمخۆرو خوێندەواری وەك مامۆستا ئەحمەدن، کە لە کەشکۆڵێکدا کۆیانبکاتەوەو بیخاتە بەردەم خوێنەرانی کوردو بەرەی نوێ .

خۆزگە هەموو کەس وەك مامۆستا مەلا ئەحمەد یان وەك مامۆستا مەلا کەریمی مودەڕیس ژیاننامەی زانایان و ڕووداوی پیاوە داناو قسە خۆشەکانی ناوچەکەی خۆی کۆنەکردەوەو نەیدەهێڵا بفەوتێن و ئەیکردنە گەنجینەیەکی دەوڵەمەند بۆ نەوەکانی داهاتوو.

لەوانەیە ئەم نووسینانە بە دەردی هەموو کەسێك نەخوات، یان کەسانێك هەبن گاڵتەیان بە کۆکردنەوەی ئەم کەلتوورە کوردەوارییە بێت، بەڵام لە ڕاستیدا ئەم نووسینانە پڕن لە ئاماژەی جوان، وەك:

- پیشاندانی کاریگەری قووڵی پەروەردەی ئیسلامی لە ناو کۆمەڵگەی کوردەواریدا .
- نیشاندانی زەروورەتی ئەو پەروەردە ئیسلامییە بۆ ڕاگرتن ومەحکەمکردنی کۆمەڵگەکەمان .
- دەربڕینی ڕاستی ئەو وادەو بەڵێنانەی کە خودا وپێغەمبەری خوا ئەیدەنە خەڵکی کاتێك پابەندی پەیامی پەروەردگار ئەبن، پێشکەشکردنی ماددەیەکی خاوی دەوڵەمەند بۆ چیرۆکنووسان وشانۆکاران و وتاربێژان، تا هەریەکەیان بە شێوازی خۆی جارێکی تر ئەو چیرۆکانە دابڕێژێتەوەو فیلم وکتێب و وتاری لێ دروست بکات .

ئەم جۆرە نووسینانە جگە لە تام و چێژی تایبەتی خۆیان، ئەبنە ئاوێنەیەکیش: خوێنەر خۆی دەبینێتەوەو بۆی دەردەکەوێت کە ئەو تا چەندە لەو هەڵوێستانەوە نزیکە یان دوورە، من بڕوام وایە خوێنەر پاش خوێندنەوەی ئەم ڕووداوە ڕاستەقینانە بە خۆیدا دەچێتەوەو دەستکاری هەندێ بیروڕاو هەڵوێستی خۆی دەکات، چونکە چیرۆك بەهێزترین وەسیلەیە بۆ ئامۆژگاری و پەروەردەکردنی هەم تاك وهەم کۆمەڵ..

یاخوا دەستی مامۆستا ئەحمەد خۆش بێت ونمونەی زۆر ببێت لە ناو کۆمەڵگەکەماندا .

إكرام كريم

٢٠١٣/٧/١٢

## به ناوی پەروەردگاری میهرەبان

## پێشەکی

سوپاس و ستایشی هەمیشەو بەردەوام و بێپایان بۆ خولقێنەری فریشتەو پەری و ئادەمییەکان، ڕەوانەکاری تەواوی فروستادەو پێغەمبەرەکان، وەگەڕخەری ژیانی تەواوی خاوەن گیان و ڕۆح لەبەرەکان، ڕاخەری فەرش و سفرەوخوانی زەوی و ڕاگری چەتری ئاسمان، ڕاگیرکەری شاخ و چیاکان، هەڵقوڵێنەری کانی و سەرچاوەو کارێز و فرمێسکی چاوان، ئەو خوایەی ڕۆح و دڵ و گیان دەخاتە پێکەنین و گریان .

سەلات و سەلامی هەمیشەو بەردەوام لە سەر پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ)، ڕەزامەندی و میهرو خۆشەویستی خوا بۆ دیداری یارو یاوەران و شوێنکەوتوان و زاناو پیاوچاکان .

چیرۆك و بەسەرهات سەربازی خودان، دڵەداخراوو دەرونە خەمبارو خەمۆك و گیان و لاشە گرژ بووەکانی پیێ هۆگر دەکات، چاوەوشك و برینگ و بێئاوەکان لەوشکەساڵییەوە دەکاتە بەهاری تەڕو پاراو، ڕووە گرژو تاڵ و غەمبارەکان گەشدەکاتەوەو دەیانکاتە خونچەگوڵی دەم بەخەندەی بەهار، تەنانەت بەرامبەر دۆست و دوژمن و بەدکار .
چیرۆکەکان پەند و ئامۆژگاری و دەرسن بۆ ژیر و خاوەن عەقڵەکان[1] .

---

[1]- خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿لقد كان في قصصهم عبرة لأولي الألباب﴾ يوسف ١١١ .
واتە: (بە دڵنیاییەوە لە چیرۆکەکانیاندا پەندی زۆر هەیە بۆ ئەوانەی خاوەنی ژیرین).

مالیکی کوڕی دینار (ڕەحمەتی خوای لیّ بێت) فەرمویەتی: ((الحكايات تحف الجَنَّة))، واتە: چیرۆك و بەسەرهاتەکان دیاری بەهەشتن، شێخ جونەیدی بەغدادی (ڕەحمەتی خوای لیّ بێت) فەرمویەتی: ((الحكايات من جنود الله عزوجل، يقوي بها إيمان المريدين، فقيل له: هل لهذا من شاهد؟ قال: قوله تعالى: ﴿وكلا نقص عليك من أنباء الرسل ما نثبت به فؤادك ...﴾)). واتە: چیرۆك جۆرێکە لە سەربازی خوداو ئیمانی ڕێگەی ڕێبواری خودایان پیّ بەهێز و پتەو دەبێت، لێیان پرسی بەڵگەت هەیە بۆ ئەمە؟ فەرمووی: ئەو فەرمودەی خوای گەورە کە دەفەرموێت: ﴿تەواوی چیرۆکی پێغەمبەرەکانت بۆ باس دەکەین تا دڵت پێی دابمەزرێت.﴾ [1].

لێرەشەوە هەقی خۆیەتی سوپاس و نزای خێرو پێزانینم دەرببڕم و ئاراستەی هەموو ئەو بەڕێزانەی بکەم کە لەکۆکردنەوەو نوسین و هەڵەچنی و پێداچونەوەو چاپکردنی ئەم بابەتەی بەردەستان بەشدارییان کردوم؛ لە خوام داوایە بیکاتە توێشوی سەفەرو گەشتی بەرەو خواچونمان.

هەروەها جێی خۆیەتی لێرەشدا ئاماژە بەم چەند خاڵە بکەم :

یەکەم: کۆمەڵێك لەخوێنەرانی بەرگی یەکەمی ئەم کتێبە پرسیاریان کردبوو بۆچی ناوت ناوە (پایزە برا)؟ و شەی (پایزە برا) چی دەگەیەنێت؟

بە کورتی دەڵێم: لە کوردەواریدا (پایزە برا) بەو کەسە دەوترێت کە لەگەرمەی کاسپی وئیشوکاردا سەردانت نەکاو ماندوبونیەکیشت لیّ ناکات، کاتی بەهارو هاوین و کاتی ئیشوکار ناتناسێت، بەڵام هەر کەپایزی درەنگکردو کاتی بەرزۆپاو چیرۆك گێڕانەوەو کاتی

---

[1] - صلاح الأمة في علو الهمة ج١/ ص١٠٩ .

حاسلات هات، سیلەی ڕەحمی دەجولێ و دێ بۆ سەردانت بۆ سەرسفرەو بەر زۆپا.

بۆیە ئەم ناونیشانەشم بۆ کتێبەکە هەڵبژارد، لە ناونیشانی چیرۆکێکی پڕمانای ناوکتێبەکەوە وەرمگرت، کە بەسەرهاتی دوو برایە، یەکێکیان لە کاتی دەوڵەمەندی و بوندا براو برازاکانی لە بیر نەبووەو بەرامبەریان بێبەزەیی بووە، بەڵام لە کاتی هەژارکەوتنیدا بە قوربان و بەساقەیان دەبێت و پیایاندا هەڵدەڵێت .

دووەم: چۆن ئەم بەسەرهاتانەم کردە کتێب؟

لە منالێمەوە زۆر حەزم لە بەسەرهات و چیرۆك و ژیاننامەی پێغەمبەران و پیاوچاکان بووە، لە دەرس و دەورو وتارو کۆڕو مەجلیسیشدا زۆر چیرۆك و بەسەرهاتم دەگێڕایەوە، هەروەها بە سامان و گەنجینەی ئەم میللەتە موسوڵمانەشم دەزانین، وامدەزانی و واشدەزانم کە ئەم خەزێنەو گەنجینەیە نابێت بفەوتێت و بێهودە بڕوات، بەڵکو دەبێ بپارێزرێ و لە شوێنی تایبەتی و قاسەی مەحکەمی خۆیدا پاسەوانی لێبکرێت و بپارێزرێت، ئێمەش هەمو لێپرسراوین بەرامبەر هەموو جۆرە سامان و گەنجینەیەکی ئەم گەلەی خۆمان.

سێیەم: لەهەموو کەموکوڕی و هەڵەو پەڵەیەك داوای لێبوردنم هەیە، سەرەتا لەخزمەت خودای پەروەردگاردا، و دواتریش لە خزمەت هەر کەسێکدا کە گلەیی و گازندەیەکی هەبێت لە بڵاوکردنەوەی هەر بەسەرهاتێك، یان بوونی هەڵەو کەم و زیادی یان هەر زیادەڕەوی و کەمتەرخەمییەك، یان هەر بەسەرهاتێك مافی خۆییم نەدابێتێ، چونکە کاری مرۆڤ بێ کەم و کوڕی نابێ، و ناشبێت مرۆڤەکانیش لە ترسی کەموکوڕی و ڕەخنە هیچ کارێك نەکەن .

چوارەم: ڕەخنەو تێبینی و سەرەنجەکانتان وەکو چەپکە گوڵ وەردەگرم و بە بەخشش و خەڵاتیان دەزانم، بۆیە هیوادارم هەموو خوێنەرێك کە ڕەخنەیەکم بۆ دەنێرێ، واهەست بکات کە بە دیارییەوە هاتووە بۆ لام.

پێنجەم: ئەم نوسراوەی بەردەستان –کتێبی پایزە برا، بە هەموو بەرگەکانیەوە– تەنها ماڵ و سامانی من نیە، وەکو پێشتریش باسمکرد گەنجینەو سامانی میللەت و گەلەکەمانەو ئەرکی هەمومانە کۆی بکەینەوە، و بینوسینەوەو شەنوکەوی بکەین، بە هەمووومان خەرمانی پڕ پەرو بومی سوربکەین و بەرهەمی بهێنین، کەواتە خوێنەری بەڕێز! تۆش هەر بەسەرهاتێکی گونجاو هاوشێوەت لەلایە بەشداری ئەو خێرە بەردەوامە بکە، بەڵام دەبێت بابەتەکەت بابەتێکی ڕۆحی و سەرنجڕاکێش و ڕاست و دروست بێت، نەك چنراوی خەیاڵی خۆت یان کەسێکی تر بێت. بەمەش لە فەوتان ڕزگاری دەکەیت و دەبێتە زەخیرەو توێشویەکیش بۆ هەموو لایەکمان .

لێرەشدا کۆتایی بەم پێشەکیە دێنم و هەموو لایەکتان بەخودا دەسپێرم و لەخوادا داوادەکەم لێمان وەرگرێ و مایەپوچ و دەستەخەڕۆمان نەکات و تای تەرازوی چاکەکانمانی پێ سەنگین و قورس بکات .

لە کۆتاییشدا سوپاس و پێزانینم ئاراستەی مامۆستا ئیکرام کەریم و مامۆستا کاظم علی و کتێبخانەی تیشك دەکەم، کە ئەرکی سەرەکی نووسین و پێداچونەوەو بەچاپگەیاندنی ئەم نوسراوەیان گرتە ئەستۆ.

مەلا ئەحمەدی شەریعە – ٢٠١٣/٦/٢٤

دوشەممە– دوای نوێژی عەسر/ سلێمانی مەجیدبەگ

# دوای بیست و پێنج ساڵ ئاڵتونە دزاوەکەی بۆ هێنانەوە

تۆبەکردن یەکێکە لە پایە سەرەکیەکانی مانەوەو بەردەوامی بانگەوازی ئیسلامی لەسەرانسەری دونیادا، بە درێژایی مێژوو ملیۆنەها خەڵك دوای تاوانکردن و خراپەکاری و لە خوا یاخیبوون خوا تەمەنی درێژکردن،و ڕوی ڕەحمەتی تێکردن، پێش ئەوەی بە خراپەکاری و گوناحباری بمرن بەهرەی تەوبەکردنی پێ بەخشیون، فرمێسکی پەشیمانیان بۆ ڕابردوویان هەڵڕشتوەو پەشیمانیان دەربڕیوە، کارو هەڵویستی سەرسوڕهێنەریان تۆمار کردووە کە بە بیستن و خوێندنەوەی ئەو هەڵوێستانە مرۆڤ سەرسام دەبێ. ئەمەش دیمەنی تەوبەو پەشیمانی تەوبەکارێکە لە سەر زمانی مامۆستا سید علی عبد الواحد[1]:

لە وتاری هەینی ڕۆژی ٢٠١٢/١/٦ لە مزگەوتی شێخ عبدالقادری چوێسە باسی هۆکاری باران نەبارینم کرد، بەتایبەتی گوناحباری و خواردنی ماڵی خەڵکی و گوێنەدان بە گێڕانەوەی مافی خەڵکی، بۆ ئێوارە کە چومە ماڵەوە زەرفێکیان بۆ هێنام، وتیان: ئەمە ژنێك هێناویەتی، وتویەتی: مامۆستا خۆی دەزانێ چیە، کە زەرفەکەم هەڵپچڕی گۆبەرۆکێکی ئاڵتون و نامەیەکی دەستخەت بوو، خێرا نامەکەم خوێندەوە، نوسرابوو: مامۆستا من ئەمڕۆ لە مزگەوتەکەی تۆ نوێژی هەینیم کردو گوێم لە وتارەکەت بوو زۆر کاری تێکردم، ئەم گۆبەرۆکەم بیست و پێنج ساڵ لەمەوبەر دزیوە،

---

[1]- مامۆستا (سید علی سید عبدالواحد) دانیشتووی گەڕەکی (شێخ عبدالقادری چوێسە)یە، وتاربێژی مزگەوتی (شێخ عبدالقادر)ەو پێشنوێژی مزگەوتی (عوسمان ئاغا)یە.

کاتێكماڵی فلان کەسی ناسیاوتان ژنیان هێنا بۆ (ك) کوڕیان، ئەوکاتە زۆر حەلاڵ و حەرامم لێك نەئەدایەوەو موحتاجیش بووم، گۆبەرۆکەکە ٢٠ مسقاڵ بوو، ئەو کاتە هەر دەستبەجێ فرۆشتم و خەرجمکرد، بەڵام ئێستا چومە بازاڕ ئەم گۆبەرۆکەم بۆ کڕیونەتەوە کە بیست مسقاڵەو هەروەك ئەو عەیارە هەژدەیە، (پەنجا گەلا)م پێداوە، جا توخوا مامۆستا تۆ وەکیلی من بەو بۆیان بەرەوەو پێیان بڵێ گەردنم ئازادکەن.

منیش بۆ بەیانی گۆبەرۆکەکەم برد بۆلای زەڕەنگەر، کێشام تەواو بوو بیست مسقاڵی عەیارە هەژدەبوو، نرخەکەشی پەنجاو یەك گەلابوو، ئیتر لەماڵەوە دامنا هەتا ڕۆژی هەینی داهاتوو کە دەیکردە (٢٠١٢/١/١٣)، لە وتارەکەمدا باسی ئەو هەڵوێستەم کرد، کە زانیم بێگومان ئەو خوشکەی ئەم کارەی کردووە لێرەیەو گوێی لێیە، هەرچەند من نەمدەزانی کێیە.

ئینجا شەو لەگەڵ خێزانمدا ئاڵتونەکەمان هەڵگرت و ڕۆیشتین بۆ ماڵەکە، کە زووتر دراوسێمان بوون و هاتووچۆمان هەبوو، بەڵام ماوەی دووساڵ بوو نەچووبومە ماڵیان، زۆریان پێخۆش بوو، نەشیان دەزانی هەواڵی خۆشترم پێیە.

دوای ماوەیەك دەستم کرد بە پرسیار کردن، کوڕەکان کێیان ژنی هێناوە؟ ئەی کچەکان شویان کردووە؟ لەناو پرسیارەکاندا وتم: ئەرێ ئێوە کوڕێکتان هەبوو بەناوی (ك)؟ وتیان: بەڵێ ئەوەتا لە خزمەتتایە، وتم: ئەی ئەو کاتەی (یان ئەو ڕۆژەی) کە ژنتان بۆ گواستەوە هیچتان لێ ون نەبوو؟ هەموو بەسەرسوڕمانەوە سەیری یەکیان کرد، وتیان بۆ مامۆستا هیچ بووە؟ وتم: هەر حەز دەکەم پرسیار بکەم ئەگەر لە بیرتان

مابێت، سەیرێکی یەکتریان کرد، وتیان: بەڵێ مامۆستا گۆبەرۆکێکمان لێ ون بوو، بێسەرو شوێن بوو کەس نەیزانی چی لێهات، ئێمەش لێی نائومێد بووین و باسمان نەکرد، ئینجا منیش گۆبەرۆکەکەم دەرهێناو وتم: ئافرەتێك لە دوای نوێژی هەینی ودوابەدوای ئەوەی گوێبیستی وتاری هەینی بووە لە مزگەوتی خۆمان، ئەم گۆبەرۆکەی خستۆتە زەرفێکەوەو هێناویەتیە ماڵی ئێمەو دایناوەو ڕۆیشتوەو ئەم نامەیەشی نوسیوە، منیش وەك ئێوە نازانم کێیەو نایناسم و نەمبینیوە، بەڵام منی کردۆتە وەکیل کە ئەو گۆبەرۆکەتان تەسلیم بکەمەوەو داواتان لێبکەم گەردنی ئازاد بکەن، خێزانی ماڵەکە بە بیستنی قسەکانی من هەموویان دەستیان کردە گریان و گەردنیان ئازاد کردو منیشیان لەگەڵ خۆیان دڵخۆشکرد.

ئەوەش کە زۆر مایەی سەرسوڕمان بوو! ئەو هەفتەیەی کە من بەسەرهاتەکەم باسکرد (٢٠١٢/١/١٣)، بارانێکی خۆش و بەلێزمە زۆربەی [illegible]ی کوردستانی گرتەوە، نەك هەر من و خانەوادەی خاوەن گۆبەرۆك و تەوبەکارەکە دڵخۆشبووین، بەڵکو تەواوی خەڵکی کوردستان و گژوگیاو دارو درەخت گوڵ و گوڵزارو دەشت و دەرو هەردو کانی و چیاکان و باڵندەو گیانلەبەرو زیندەوەریش دڵخۆشبوون بەبارینی ئەو بارانە خۆش و بەپیتە، و زۆربەی چیاکانی کوردستانیش مێزەرو سەرپۆش و تارای سپی و زیوییان پۆشی، بەهۆی ئەو چەند تاوە بەفرەسپی و بێگەردەی زۆربەی شوێنەکانی کوردستانی گرتەوە.

لەوەش گەورەترو سەنگینتر ئەوەیە کە خوای گەورەش تەوبەی تەوبەکارانی زۆر پێخۆشە، زیاتر لەو کەسەی پێخۆشە کە کەلوپەل و

خواردن و خواردنەوەکەی بە وڵاخەکەیەوە لە دەشتێکی بێبندا لێوندەبێت و دەست لە ژیانی خۆی دەشوات، بەڵام لەناکاو لەپڕمەی وڵاخەکەی ڕادەچڵکێ و لە خۆشیدا لێی تێکدەچێت کە چۆن سوپاس و ستایشی خوا بکات، بۆیە لەجیاتی ئەوەی بڵێ: (خوایە تۆ پەروەردگاری منی و منیش بەندەی تۆم)، دەڵێ: (خوایە تۆ بەندەی منی و من پەروەردگاری تۆم). بەڵام خوا لێی ناگرێت و لەسەری نانوسێت.

## سوڵحەکەی کاک ئەحمەدی شێخ

ماموٚستایان و زانایانی ئیسلامی کوردستان هەمیشە لە خزمەتی خەڵکیدا بوون خزم بوبێت یان بێگانە، ناسیاو یان نەناسیاو، دۆست یان دوژمن، دوور یان نزیك، تەنانەت زۆر جار سنوری وڵاتیان بڕیوە لە پێناو ئاشتکردنەوەی دوو هۆز یان دوو بنەماڵە، تەنانەت دوو کەسیشدا. لەم بارەوە لەبەرگی یەکەمی ئەم کتێبەدا چەندین نمونەی قەشەنگ و دیمەنی سەرنج ڕاکێشم نووسیوە، وەکو لە لاپەڕە (٤٢)دا داستانی ئاشتکردنەوەی دوو هاوسەرم نووسیوە دوای (٤٦) ساڵ دووری و لێکدابران، لەلایەن ماموٚستا خەمخۆر ماموٚستا مەلامحمودی ئازادییەوە، هەروەها چەند بابەتێکی تر بۆ نمونە لە لاپەڕەکانی (١١١) هەمان کتێبی -پایزە برا-دا.

لێرەشدا سەرەنجی خوێنەر لە خوشکان و برایان ڕادەکێشم بۆ ئاشتکردنەوەی دوو هاوسەر، بەڵکو هەردوو بنەماڵەکەشیان لەلایەن زاناو

خواناسی گەورەی گەلەکەمان کاك (ئەحمەدی شێخ مەعروفی نۆدەهی) ڕەحمەتی خوایان لێبێت.

زانای گەورە مامۆستا (شێخ صدیق سەرگەتی)[1] (ڕەحمەتی خوای لێبێت) لە مانگی (٥/٢٠١١) بۆی گێڕامەوە، فەرمووی: ساڵێك لە دەڤەری مەریوان چومە گوندێك بەناوی (سورکەوڵ)، لەوێ لەگەڵ پیاوێکی بەتەمەن و پەککەوتوو دەستمان بە قسەکردن کرد، دوای ئەوەی بۆی دەرکەوت خەڵکی عێراق و دەوروبەری شاری سلێمانیم زۆری پێخۆش بوو، زۆر زیاتر ڕێزی لێگرتم، وەکو کەسێکی پایەدارو گەورە لێی دەڕوانیم، دوای هەناسەیەکی قووڵ وتی: سلێمانی مایەی شانازی هەموو کوردێکە، کە پیاوی زاناو خواناسی وەك کاك ئەحمەدی شێخی تیا هەڵکەوتووە، جا گوێبگرە یادەوەریەکی کاك ئەحمەدی شێخت بۆ بگێڕمەوە لەم گوندەدا، وتم: خۆت بە خزمەتی گەیشتووی؟ وتی: بەڵێ .

دەستی پێکرد وتی: من دەستە هەرزەکار بووم، لەم گوندەی ئێمە پیاوێك کچێکی خۆی دابوو بە کوڕێکی گوندێکی دراوسێمان، دوای ماوەیەك ناکۆکیەك دەکەوێتە نێوانیان، ئافرەتەکە زویر دەبێت و دێتەوە بۆماڵی باوکی، باوکیشی زۆری پێناخۆش دەبێت و دەیەوێت بە هیچ

[1] درەنگ لە گەڵ مامۆستا (شێخ صدیق سەرگەتی) ئاشنا بووم و ماوەکەشی تەنها دووساڵ بوو، بەڵام ئەوەندەی بە یەکەوە بووین نێوانمان زۆر خۆشبوو، وهەفتانە چەند جارێك بە خزمەتی دەگەیشتم، لە سەردان وسەیران و بۆنەشەرعی و کۆمەڵایەتییەکاندا لە خزمەتیدا دەبووم، ئەویش گەلێك کەیفی بە من دەهات، لە کۆتا ڕەمەزانی ژیانیدا بەڵێنی پێدام کە دوای ڕەمەزان کۆمەڵێك بەسەرهاتم بۆ بگێڕێتەوە، بەڵام مەرگ مۆڵەتی نەداو دوای جەژن لە ڕۆژی (١٢/٩/٢٠١١)دا کۆچی دوایی کرد، خودای گەورە لێی خۆشبێت.

جۆرێك جارێكی تر ئەو كچە نەداتەوە بە هاوسەرەكەی، بۆیە بە بۆچونی خۆی سوێندێك دەخوات (یان بلێین بریارێك دەدات) لەبەرچاوی خەڵكی، بۆ ئەوەی بنبەستی كارەكە بكات و ئیتر كەس داوای ناردنەوەی كچەكەی لێنەكات، دەڵی: بەزاتی خوا ئەو كچە نادەمەوە مەگەر كاك ئەحمەدی شێخ بێت تكای بۆ بكات، ئەوەش قسەی ئەوەل وئاخری بوو، بەخەیاڵی كەسیشدا نەدەهات حاجی كاك ئەحمەدی شێخ رێی بكەوێتە ئەو دێ یە، بەتایبەتی لەو سەردەمەدا كە هاتووچۆ زۆر گران بووە.

بەڵام بەقەدەری خوا كەسێكی خەڵكی ئەم گوندە بەرێبواری رێی دەكەوێتە سلێمانی و لەگەڵ كەسانێكی ئەم شارەدا یەك دەكەون، دەست دەكەن بە قسە گێرانەوەو سەرگوزشتەو بەسەرهات، ئەم پیاوەش باسی كێشەی ئەو ماڵە دەگێرێتەوەو باسی سوێندەكەی كابراش دەكات، ئەم قسەو بەرخودەش بەرگوێی كاك ئەحمەدی شێخ دەكەوێتەوە (رەحمەتی خوای لێبێت)، ئیتر هەر بەبیستنی ئەم بەسەرهاتە خەم و پەژارە دایدەگرێت و دەفەرموێت: (لاحول ولا قوە الا باللە)، هەرچۆنێك بێ ئەو شەوەی لێدەروات، بۆ بەیانی كەشكۆڵ و بارگەو بنەی لێك دەنێت، ماڵ و خێزانیش ئاگادار دەكاتەوە كە ئەو دەچێتە سەفەر بۆ كارێكی زۆر زەرور، ئەی قوربان ناكرێ ئەم سەفەرە دوابخەیت؟ بۆ بەپەلەو گورزگمەت؟ نەخێر ناكرێ یەك سەعات دوای بخەم، دەی با چەند كەسێك لەخزمەتدا بێن، نا كورەكانم ئێوە خۆتان لە كار مەكەن ئەو كارە ئەركی منە خراوەتە ئەستۆی من.

بەڵێ بەیانی زوو لە سلێمانیەوە بەڕێ دەکەوێ دوای چەند ڕۆژێك دەگاتە گوندی (سورکەوڵ)، پرسیاری ماڵی کابرا دەکات بەو ناونیشانەی کە ڕێبوارەکەی گوندەکەیان لە سلێمانی باسی کردبوو ناوی باوکی کچەکەشی باسکردبوو.

کە دەچێتە ماڵی کابراو دادەنیشێت خانەخوێش نایناسێت، بەڵام وەکو کەسێکی موسوڵمان و داب و نەریتی کوردی موسوڵمان ئەوپەڕی ڕێزی لێدەگرێت، دوای نان وچا خواردن دەڵێ قوربان چۆن ڕێت کەوتۆتە ئێرە؟ ئەویش دەفەرموێ: بۆ کارێکی خێر هاتووم.

جا وەکو مامۆستا شێخ صدیق باسی کرد وفەرمووی: سەرپۆش و لەچکی ژنان جیابوو لەسەرپۆش و لەچکی کچان، کاتێك دوو ئافرەت بە خێرهاتنی کاك ئەحمەدی شێخ دەکەن هەردووکیان سەرپۆشی ژنانەیان بەسەرەوە دەبێت، شێخ بە خانەخوێ دەفەرموێت تۆ دوو ژنت هەیە؟ دەڵێ: نەخێر قوربان گەورەکەیان هاوسەرمەو ئەوی تریان کچمە، شێخیش نەجارێ خۆی دەناسێنێ و نەدەڵێ هیچم بیستوە، دەڵێ: ئەی کە کچتەو شوی کردوە بۆ لێرەیە؟ دەڵی: قوربان کچەکەم لە گەڵ هاوسەرەکەی بەینیان تێکچوەو هاوسەرەکەشی ماڵیان لە دێیەکی ترە، منیش زۆر ڕقم لێی هەستاوە، بە خوا سوێندێکم خواردووە هەر چاری نەبێ، چونکە نامەوێ بە هیچ جۆرێك بیدەمەوە، شێخیش دەفەرموێت: ئادەی بزانم سوێندەکەت چۆنە؟ بەڵکو چارەسەرێکی هەبێت، کابراش دەڵێ: سوێندێکی وام خواردووە چاری نەبێت، شێخیش زۆری لێدەکات کە ئەگەر چاریشی نەبێت هەر بۆم باس بکە.

ئینجا کابرا دەڵێ: وتومە (بەخوا کچەکەمی نادەمەوە مەگەر کاك ئەحمەدی شێخ بێ تکای بۆ بکاو تەکلیفم لێ بکات)، بۆیەش ئاوا سوێندم خواردووە کە کچەکەی پێنەدەمەوە، چونکە هەرگیز ناچێتە ئەقڵەوە کاك ئەحمەدی شێخ ئەم کێشەیە ببیستێت، یان لە سلێمانییەوە بێت بۆ ئەم گوندە، کابرای زاواشم کەسی وا خەمخۆری نیە بچێت بە دەمیەوەو بۆی چارەسەر بکات.

ئینجا کاك ئەحمەدی شێخ (ڕەحمەتی خوای لێبێت) هەناسەیەکی ئاسودەیی هەڵکێشاو بە دەنگێکی پڕ شەرم و ئەدەبەوە دەفەرموێت: من کاك ئەحمەدم، کابرا دەڵێ: کام کاك ئەحمەد؟ شێخ دەفەرموێت: ئەو کاك ئەحمەدەی تۆ سوێندەکەت لەسەر خواردووە (کاك ئەحمەدی شێخ)، ئیتر یەکسەر خانەخوێ بەرزەپێ ڕاست دەبێتەوەو هەردوو دەست و ناوچەوانی شێخ ماچ دەکات ودەڵێ: قوربان تۆ چۆن ڕێت کەوتۆتە ئێرەو ئاوا ئێمەت شەرەفمەند کرد؟! دەفەرموێت: لەسلێمانیەوە هاتوم بۆ ئێرە هەتا کچەکەی تۆ تەڵاق نەدرێ وکوڕێکی هاوزبان و هاودینیشم ماڵی لێنەشێوێت.

ئیتر بۆی دەگێڕێتەوە کە چۆن کابرای گوندی سورکەوڵ بە ڕێبواری هاتۆتە سلێمانی لەناو خەڵکیدا ئەم کێشەیەی ئێوەی باسکردوەومنیش بیستومەتەوە، ئیتر هەر لەوکاتەوە کێشەکەی ئێوەم بیستوو بەتایبەتیش کە ناوی منی تێدا برابوو خەم و خەفەت دڵ و دەروون و ڕوخساری داگرتم، چارەسەری ئەم کێشەیەو تەڵاق نەدانی کچەکەت و تێکنەچونی

خانەو لانەی کوڕو کچە موسوڵمانێکی کورد بووە خولیای سەرم، کە کێشەکەم بیست بۆ بەیانی بەڕێکەوتم بۆ خزمەتتان.

ئینجا کابرای خانەخوێی خاوەن کچ زۆر زۆر ڕێز لە زاناو خواناسی گەورەو پایەداری گەلەکەمان دەگرێت ودەڵێت: قوربان! ماڵەکەی من شایستەی جەنابت نیەو من شایستەی خزمەتکاری جەنابت نیم، دەربارەی کێشەکەش کچ کچی خۆتەو کوڕ کوڕی خۆتە هەرچۆنێك جەنابت بفەرمووی و بڕیار بدەی هەروایە، ئینجا خەبەر دەنێرن بۆکوڕەکەو دێت و کچەکە دەباتەوە، خەڵکیش پۆل پۆل بە ژن و پیاوەوە بە گەورەو بچکۆلەوە دێنە خزمەتی شێخ .

ئەمەش دیمەنێکە لە خەمخۆری زانایانی میللەتی کورد لە گەل ومیللەت و وڵاتیان.

## پاداشتی ژنی بێ وەفا

وەفاداری جوانترین ڕەوشتێکە کە ئادەمیزادی چاك و خراپ لێك جیا دەکاتەوە، وەفاداری دەبێتە مایەی ڕێزو پلەو پایەو جێگەی متمانەی دۆست ودوژمن.

هەڵوێست و ئاکارو ڕەفتارو ڕەوشتی وەفاداران بە درێژایی مێژوو دەبنە پەندو ئامۆژگاری و چیرۆك و داستانی پەروەردەکاران و وتاربێژان و شەوچەرەی دیوەخان و بەرزۆپای کۆڕو دانیشتنەکان لەشارو لادێ، باوکان و دایکانی خەمخۆرو پەروەردەکاران منداڵ و کوڕو کچی خۆیان و

خزمان و دەرودراوسێکانی پێ گوش دەکەن، چیرۆك و داستان و بەسەرهاتی وەفادارانیان بۆ دەکەنە بەرنامەی مەشق و ڕاهێنانیان پێدەکەن، تا لە وردو درشتی ژیانیاندا بەرامبەر خواو خەڵکی خوا وەفادارین.

مرۆڤی وەفادار لەسەردەمی ژیانیداو بگرە سەدان و هەزارانساڵیش دوای مردنیان کەسانی ژیرو چاکەخواز ئاواتیان پێ دەخوازن، تەنانەت ئاوات بە هاوڕێیەتیشیان دەخوازن.

ئادەمیزادەکان ئاژەڵ و باڵندەو چوار پێی بەوەفاشیان خۆشدەوێ، حەزدەکەن لەماڵی خۆیانداو لەگەڵ خۆیان بیانخەوێنن ولە خواردنی خۆیان بەشیان بدەن، بەڵکو پارووی دەمی خۆیان دەدەنێ و خزمەتیان دەکەن و خەرجیان دەکێشن و بەنەخۆشکەوتن ومردن ولەدەستدانیان خەفەتبار دەبن. ئەوەتا دوای سەدان ساڵ خوای گەورە لەقورئاندا باسی سەگی بەوەفای هاوڕێیانی ئەشکەوتی کردوەو لەگەڵ دەستە گەنج و لاوە شۆڕشگێرو تێکۆشەرەکاندا ناوی سەگە بەوەفاکەشیانی بردوە، تا دونیا دونیا بێت ملیۆنەها موسوڵمان، بگرە ناموسڵمانیش دەبێ بەسەرهاتەکەیان بخوێنێتەوە.

باسی وەفاداری زۆر باسێکی گەورەو گرنگە، بۆیە لێرەدا باسی وەفاداری بەم دوو دێرە کۆتایی پێدێنم و دەڵێم: وەفاداری سیفەتی خواو پێغەمبەران ودۆستانی خواو پیاوچاکان و خواپەرستان وزاناکان وتەواوی مرۆڤە شکۆدارو شەرەفمەندەکان و هاوسەرە میهرەبانەکانە.

بێ وەفاییش ناشرینترین و قێزەونترین سیفەت و خەسڵەت و ڕەفتارو ئاکارێکە، کە تەنانەت ئاژەڵیش بێزی لێدەکات. بێ وەفا دوژمنی خواو تەواوی فریشتەکان وسەرجەم پێغەمبەران ومرۆڤەکان وجنۆکە وگیانلەبەرانە. بێ وەفایان لە مەحکەمەی خوا مەگەر هەر خوا! دەنا ڕزگاریان نابێت ودوچاری سزای سەختی بێ وەفایی خۆیان دەبن.

هەر ئادەمیزادێك بەئەندازەی گەردیلەیەك ژیری و هەست و نەستی هەبێت تف ولەعنەتی بێ وەفاییان دەکات، تەنانەت ئەگەر لە چیرۆك و خەویشدا بێ وەفایەك ببینێ یان بەسەرهاتێ ببیستێ نەفرینی لێدەکات وئەوەندە خۆی لێ دوورەپەرێز دەگرێت وخۆی لێدەپارێزێ سەدان جار زیاتر لە خۆپاراستنی لە ئاژەڵی دڕندە.

هەر لەم سەردەمەی خۆماندا ئەمانبینی و ئەمان بیست سەدان بەسەرهاتی بێ وەفایی لە نێوان دوو هاوسەرداو ناپاکی کردن لەیەکتر، تا هاوسەرەکەی جوان و گەنج و شۆخ و شەنگە بەزمانی لوس و قسەی شیرین و بەرتیلی قسەکانی دەیخەڵەتێنێت و لە خشتەی دەبات، ئینجا کە چەند منداڵێکی بوو کەمێك جوانی و ناسك و نازداریەکەی نەما، لێی دەکەوێتە برو بیانو خەفەت پێدانی وسوکایەتی پێکردنی وهەڕەشەی تەڵاق و ژنی دووهەم[1] هێنان وبوختان و درۆو دەلەسە بۆ هەڵبەستن، ودەیان ڕێگەی ناشەرعی و پیلانی شەیتانی و هیتر.!!

---

[1] – لێرەدا مەبەست ئەوەیە وەك هەڕەشەو خەفەت پێدان بە ژنەکەی، نەوەك مەبەست پێی لایەنە شەرعیەکەی بێت و بە شێوەیەکی جوان و بێڕێزی نەکردن بەرامبەر هاوسەری یەکەمی بیەوێت هاوسەری دووەمی بخوازێت.

لەم سەردەمی چەپرەوی و بێ ویژدانی و بێ وەفاییەدا ئەو توخمە لە ئافرەتانیش پەرێزیان لە پیاوان پاکتر نییەو پیلانی شەیتانی وایان گێڕاوە کە بە بیستنیان هەموو خاوەن هەست و ژیریەك پێستی مووی گرژ دەبێت و موچرکە بە لاشەو گیانیدا دێت.

لێرەدا ڕوداوێکی نەخوازراوم بیر هاتەوە کە بڕواناکەم کەسێك هەبێت ئەم بەسەرهاتە ببیستێت وخەفەتی لێ نەخوات.

برایەکی بەڕێزو خۆشەویستم بەناوی کاك (ڕزگار)[1] بۆی گێڕامەوە:

پیاوێکی باش هەبو زۆر بەئەدەب و بەڕێز بوو، دەروردراوسێ زۆر لێی ڕازی بوون، ژنەکەی نەخۆشکەوت، ئەمیش زوو زوو بە ژنەکەی دەوت: "ئافرەت تا من بمێنم خەمت نەبێت، خۆم وماڵ و سامانم لە پێناوی چاکبوونەوەی تۆدا فیدا دەکەم ودەیکەمە قوربانی تۆ، بێگومان بەو خەیاڵت ئاسودە بێت، ئەوەی لەدەستم بێت کەمتەرخەمی و پیسکەیی ناکەم"، کاك... ئەم هەڵوێست وقسانەی ڕۆژانە بۆ دوبارە و چەندبارە دەکردەوە بۆ ئەوەی دڵتەنگ نەبێت و دوچاری خەمباری و خەمۆکی نەبێت.

ئەم ئافرەتەش هەر کە دەیبینی هاوسەرە دڵسۆزو خەمخۆرو بەوەفاکەی ئاوا بە گوفتارو ڕەفتارو کردەوەو هەڵوێستی مەردانەی ڕاستی وتەو مافی هاوسەریەتی ڕاستەقینەی بۆ دەسەلمێنێت، ڕۆژ بە ڕۆژو بگرە سەعات بە سەعات ورەی بەرزدەبوەوەو بەرەو چاکبوونەوە دەچوو،

---

[1]– هاوڕێیەکی بەڕێزمە وهێندەی برا لە یەك نزیکین، هەردووکمان بە چاکمان نەزانی (ناو) بنووسین.

کاك...... ناوبانگی هەر پزیشك و نەخۆشخانەیەکی زۆر چاکی ببیستایە هاوسەرەکەی دەمودەست دەبردە لای.

تەنانەت سەردانی وڵاتی ئوردنیشی پێکرد وبردی بۆ چاکترین نەخۆشخانەو بۆلای چاکترین پزیشك، لەوێ لەلایەن پزیشکی پسپۆڕەوە مژدەی چاکبوونەوەی یەکجاری پێدرا.

دوای مانەوەی چەند ڕۆژێك لەو وڵاتە، بەڵام ئەم ژنە لە جیاتی سوژدەی سوپاسگوزاری بۆ خوا بەرێت، وبەدڵ و بە گیان وبەکردەوە ئەوپەڕی سوپاسی هاوسەرەکەی بکات، وماندوبوون و فیداکاری چەند ساڵەی لەبەرچاو بگرێت، وژیانی هاوسەری زیاتر لە بیست ساڵی لەگەڵ ئەم پیاوە بەڕێزو بەوەفایەدا لەبەرچاو بێت، هەر لە ڕێگەی هاتوچۆی نەخۆشخانەو بازاڕو لای پزیشك لەگەڵ پیاوێکی شارێکی تری کوردستان دەست دەکات بە عیشق و عیشقبازی و چاوبازی، تەلەفۆن و تەلەفۆنکاری بەدزی هاوسەرەکەیەوە.

دوای گەڕانەوەش هەر وازی نەهێناو وردە وردە بەهۆی ساردی لەگەل هاوسەرەکەی و بەهۆی هەناسە هەڵکێشان و خەفەت خواردن و قسەکردنی زۆر بەتەلەفۆن و پێکەنین و غەمباربوون، لەکاتی قسەکردن بەتەلەفۆن کارە ناپاك وناشرینەکەی ئاشکرا دەبێت وخۆشی لەلای هاوسەرەکەی باسی دەکات، دواتر کەسوکاری تێدەگەیەنرێت ئەوانیش هیچ دەسەڵاتێکیان نابێت، چونکە ئافرەتەکە دەسەڵات و شوێن گەلێك تێدەگەیەنێت کە کەس نەتوانێت بە زۆرە ملی وازی پێ بێنێت، دواتر دوای تکاو ڕجایەکی زۆر لە لایەن هاوسەرەکەیەوە "من کەم و کوڕیم چیە؟

چیم بۆ نەکردی؟ هەر کەمتەرخەمیەکم هەبوە داوای لێبوردن دەکەم و دوبارەی ناکەمەوەو ئێمە بیست ساڵە بەیەکەوەین ومنداڵەکانمان گەورەن، ئەمە دەبێتە سوکایەتی بۆ هەردوکمان و کەس و کاری هەردوکمان ...."
ئافرەتە ڕازی نەبوو هەر دەیوت تەڵاق تەڵاق.

ناچار کاك ...... تەڵاقیداو لێی جیا بووەوە، دوای ئەوەی هەرچی ئەم پیاوە شکی دەبرد لەماڵ وپارەو سامان وتەنانەت خانوەکەشی لە پێناوی ئەو هاوسەرەیدا داینا.

ئینجا کوڕە گەورەکەی کە یەکەم ساڵی خوێندنی بوو لە زانکۆ ڕازی نەبوو دایکی شوو بەو پیاوە بکات، کە خۆی بۆ بەتەڵاقداندا وکوڕو کچ وماڵ ومنداڵی کردە قوربانی، بەهەر حاڵ دایکی کوڕەکە لەگەڵ دۆستە تازەکەیدا ڕاوێژیان کردو پیلانیان دانا کە بە هەر نرخێك بێت کوڕەکە ڕازی بکەن، لە ئەنجامدا سەیارەیەکی بە چەند دەفتەرێك بۆ کوڕەکە کڕی و ئەویش بێدەنگ بوو.

بەڵام لە تۆڵەی ئەو هەموو ناسۆرو خەم پەژارەی ئەم ئافرەتە هێنای بە سەرهاوسەرەکەیدا، خوای گەورەش جورعەیەکی گەورەی لە ناسۆرو خەم و پەژارەی کرد بەناخی دڵ و جەرگی ئەو ئافرەتەدا، ئافرتەکە مارە کرا، ئەو ڕۆژەی کە هاتن بۆ گواستنەوەی، سەیارەکەیان تەسلیمی کوڕەکەی کرد تا هیچ گرفتێکیان بۆ دروست نەکات، بەڵام هەر ئەو ئێوارە ئەو کوڕە گەنج وجوانە بە خۆی وسەیارەکەیەوە خۆی کرد بەژێر گەڵابەیەکداوپان بووەوەو کەس بەزمان نەیگەیشتێ، بەڵام ژنەکە هەر پەشیمان نەبوەوەو شوەکەی خۆی هەرکرد.

ئەم ئافرەتە جەرگی سوتا ومالّ ولانەی لە خۆی شێواند، بەڵام سەرەڕای هەموو ئەمانە شەیتان فریویدا تا شوێن ئەو شوە بکەوێت کە ئارامی خۆی ومالّ ومنالّی لە سەر دانا .

## دوانزە منالّی بووەو تایلاندی خزمەتی دەكات

ئەجەل و كاتی دیاری كراوی مردن لەلایەن خواوە دیاری كراوە و تەنها چاوتروكانێك پاش و پێش ناكات، ئەگەر نا هەر ژانێكی كاتی منداڵبوونی دایكان مردنێكە.

هەمومان بیستومانە كاتێك پیاوێك چوە خزمەتی عبدالله ی كوڕی عومەر پرسیارێكی لێكردو وتی: دایكم حەوت ساڵە پەكی كەوتوەو كەنەفت و داماوە، منیش ئەم حەوت ساڵە كەمتەرخەمیم نەكردوەو بە گوێرەی توانا خزمەتم كردووەو هەر بە كۆڵ گێڕاومەو حەجم پێكردوە، وپاكم كردوەتەوەو جلوبەرگم بۆ شتوە، دەبێ مافی بەسەرمەوە مابێ؟ عبدالله (ڕەزای خوای لێ بێ) فەرموی: ئەوەی تۆ بۆ دایكت كردووە تەنها بری یەك ژانی كاتی منداڵبوونی كەوتووە.

پێغەمبەری ئیسلام –صەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت– فەرمویەتی: ڕازیبوونی خوا لەگەڵ ڕازیبوونی دایك و باوكدایەو توڕەبوون و خەشمی خوا لەگەڵ توڕەبوون و ناڕەزایی دایك و باوكدایە، هەروەها لەكاتی ڕۆیشتن بۆ جیهاد بە كەسێكی فەرموو: دایكت ماوە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: دەبگەڕێرەوە بەرپێی دایكت و دەستی لێبەرمەدە چونكە

بەهەشت لای قاچی دایکت دایە. بەکەسێکی تری فەرموو: دایك و باوکت ماون؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: کە هاتی حاڵیان چۆن بوو؟ وتی: دەستیان کرد بە گریان، فەرمووی: دەبگەڕێرەوە بۆ لایان چۆن گریاندوتن ئاوا بیانخەرە پێکەنین.

[1] جا بڕوانن بە ئەزمون دەرکەوتووە کە دایك بۆ هەر منداڵێك پانزە تا بیست ژان دەیگرێت، تەنانەت هەندێ لە دایکان سی ژان و سیوپێنج ژانیش دەبینن، بەڵکو دایکی واهەیە شەوو ڕۆژێك بەژانەوە دەمێنێتەوە ئینجا منداڵەکەی دەبێت، تەنانەت چەندەها جار ڕێککەوتووە منداڵەکەی لێنەبۆتەوەو بەو ژانوئێش و ئازارەوە سەری ناوەتەوەو ڕۆح و گیانی خۆی لەو پێناوەدا بەخشیوە، بەئومێدو هیوای ئەوەی منداڵێکی چاوگەش و پەپولە ئاسای ببێت و لە باوەشی بگرێت و ببێتە خەمڕەوێن بۆی.

ئینجا با بچینەوە سەر باسی ئەو دایکە بەڕێزەی نیوەی ژیانی ژان و تاڵی و ترس و ئێش و ئازار بووە هەتا لە ماوەی بیست و چوار ساڵ یان بیست و پێنج ساڵدا بتوانێ دوانزە منداڵ بخاتەوە، بۆ بەرهەم هێنانی هەر منداڵێکیان نۆ مانگی ڕەبەق لە سکیدا هەڵیگرتوەو پاراستویەتی و بێزوی کردوە، واتە: خەوو خۆراك و ئیسراحەت و تەواوی خۆشیەکانی ژیانی شێواون و میزاجی تێکچوەو هەنگوینی لە دەم تاڵ بووە، نۆ مانگ ژیانی بریتی بووە لە لەرزو تاو بێخەوی هەرکاتیش خەو بردبێتیەوەو چاوی سەر یەك نابێ منداڵەکەی لە ناو سکیدا خۆی جوڵاندوە، خۆی ئەمدیوو ئەو دیو کردوە قاچی ڕاوەشاندوە دەستی بزواندوەو خەبەری کردوەتەوە، دایکی بە سۆزیش خۆی بە قوربانی کردووە لە جیاتی گلەیی و ناڕەزایی ! !

دوای نۆمانگ ژیانی منداڵەکە لەسەر ڕۆح و گیان و خوێن و ژیانی دایکی، بەڵکو لەسەر حسابی خەوو خۆراك و ئیسراحەت و پشووی دایکی، ئینجا بە دەیان ژانی منداڵبوون، کە هەر ژانێکی مردنێکە بەبێ گیان دەرچوون ئینجا منداڵەکە لە دایك بوو، پاش دوو ساڵ بۆ سێ ساڵ پاککردنەوەی ئەو منداڵە کە پاك و پیسی نازانێت، دەبێ چەند جار پاکی کردبێتەوەو لەگەڵ هەر پاککردنەوەیەکدا چەندان جار بەقوربانی بووبێت و خۆی لە دەورگێڕا بێت بۆ ئەوەی هەر بەلایەك بۆ منداڵەکە دێت لەو بکەوێت و ببێتە بەلاوەگێڕی.

دەبێت چەند جار خۆی بەر سەرماو گەرما دابێت و خۆی کردبێتە قەڵغان بۆ ئەوەی منداڵەکەی سەرماو گەرمای نەبێت.

دەبێ چەندجار لەسەر نانخواردن و بە برسیەتی هەستابێت بۆ پاککردنەوەو ژێرکردنی منداڵەکەی؟ دەبێ چەندجار خۆی برسی کردبێ لە پێناوی منداڵەکەیدا؟ دەبی چەند جار حەزی لە فلان خواردن بووبێت و لەبەر منداڵەکەی نەیخواردبێت؟ نەبادا زەرەری بۆ منداڵەکەی هەبێت، دەبێ چەندجار خێری قەرار دابێت بۆ منداڵەکەی کە هیچی لێ نەیەت؟ دەبێ قەبارەی ئەو هەموو خەم و خەفەت و پەژارەیە چەند بێت هەتا دایکێك منداڵێکی ساوا گەورە دەکات؟

زانایەك دەڵێت: لە نەخۆشیدا دایکم بۆم دەگریا، کەچاکیش دەبوومەوە هەر دەبینم بۆم دەگری، کە هەژار دەبووم دایکم بۆم دەگریا، کە دەوڵەمەندیش بووم ڕۆژانە دەبینم دایکم بۆم دەگری، ڕۆژێك خۆم پێنەگیرا وتم: ئەری دایکە کاتێك کە نەخۆشم و هەژارم دەبینم بۆم دەگری

بەهەرحاڵ ناحەقت ناگرم، بەڵام کە چاك دەبمەوەو دەوڵەمەند دەبم بۆچی بۆم دەگری؟ وتی: کوڕم دەترسم دووبارە نەخۆش بکەویتەوە، یان هەژار بیتەوە، یان دزو جەردە لەسەر ماڵ و سامانەکەت بتکوژن.

کە منداڵەکانی لەسەفەرن بیریان دەکات و فرمێسکیان بۆ دەرێژێ و بە ئەندازەی زنجیرە چیایەك غەم و پەژارە لەسەر دڵیەتی، کە لەسەفەریش دێتەوە لە خۆشیا دەگری و دواتر غەم وخەفەت دایدەگرێتەوە، نەوەك جارێکی تر کوڕەکەی یان کچەکەی بچێتەوە سەفەرو بەجێی بهێڵێت.

دایك بە منداڵەکانی دەڵێ: نوری چاوەکانم هەرگیز بێخەفەت نیم کە لە خۆشیدا بن، دەترسم لێتان تێك بچێت، کە لە ناخۆشیدابن جەرگم بۆتان دەقرچێ، دەترسم لە پێش مندا بمرن و مەرگتان ببینم، دەترسم لەپێش ئێوەدا بمرم و لەدوای من تووشی ناخۆشی ببن، دایك لە ژیانیدا بێجگە لەو هەموو ئێش و ئازارو غەم خەفەت و پەژارەو کوێرەوەری و تاڵی و سوێری ژیانە، تەواوی باری گرانی سەر شانی منداڵەکانی بە بچوك و گەورەیەوە هەڵدەگرێ لەهەر ناخۆشییەك بەسەریان دێت هاوبەشەو غەم پەژارەی ئەوانیش لەگەڵ باری گرانی خۆی هەڵدەگرێ.

بەڵام ئەم دایکە دوای گەورەکردنی دوانزە کوڕو کچ بەو حاڵەی باسم کرد کە دڵۆپێك بوو لە دەریایەك، بەڵام ئێستا لە سۆزو میهرەبانی هەر دوانزەیان بێبەشە، وغەم و پەژارەو خەفەتی دووری و غەریبی هەر دوانزەشیانی بە پیری و پشتی چەماوەو هەناسەسوارییەوە لە کۆڵناوە، دوای ئەوەی سەدان کەس چێشتوخواردنی دەستی ئەو دایکە بەرێزەیان دەخوارد، ئێستا چاوی لە دەستی خزمەتکارە تایلەندییەکەیەتی کە

لەفەیەکی گۆشتی بەسەرچووی بۆ بکڕێ و بیداتە دەستی، سۆزی کوڕو کچ لە کوێ و خزمەتی خزمەتکارێکی بێگانە لە کوێ.

دوانزە منداڵ بەو حاڵە بەخێو بکەی، بەڵام کە نەخۆش کەوت و شەلەل لێیداو پەکی کەوت، دەبێ کرێکارو خزمەتکاری تایلەندی یان عەرەب بیبات بۆ نەخۆشخانە.

کاتێك ئەو شۆڕەژنە خانومانەم بینی پەکی کەوتوە پاروەکەی پۆ ناچێ بۆ دەمی خزمەتکارەکەی بە دەمییەوە دەکات، ئەویش ناحەقی نییە کە تێری نەکات و لەجیاتی چایەك نیو چای بداتێ تا کەمتر پاکی بکاتەوە.

ئەو سەردەمەم بیرهاتەوە کە ماڵەکەی پڕ بوو لە کوڕو کچ، هاوسەرەکەشی پیاوێکی بە شان و شەوکەت و بەڕێز بوو، بەڵام خانم بە ڕۆحی سوك و مەچەکی پتەوی چاوی لەدەستی کەس نەبوو.

ئێستاش دەبێ چاوی لە دەستی ئافرەتە خزمەتکارەکەی بێت ئاخۆ کەی ڕەحمی دەجوڵێ، پەترۆکێ نان یان قاشە میوەیەك یان لەفەیەکی ساردو سڕو پیوبەستوی بۆ لە دەستیخات. هەر وەکو چۆن خێر بە سواڵکەرێکی لێقەوماوی بەردەرگا دەکرێت. ئەوە دایە خانم وەجاخ کوێر بوویت وا کەست لە دەور نییە؟ فلاّن کەسیش هەر وەکو تۆی لێهاتووە دەستی شکاوم ئەویش منداڵی نەدەبوو، کچم تۆ دەڵێی چی؟! من دوانزە منداڵم پێگەیاندووە لە کوڕو کچ، ئێستا هەموویان خاوەنی هاوسەرو ماڵ و خێزان و بڕوانامەی خۆیانن، وڵاتەو وڵات و شارەو شار دەگەڕێن بۆ سەیران و سەیرو سەفاو منیشیان ئاوا بەتەنیا بەجێهێشتووە!

# گیانی کردە فیدای دایکی

(شێخ ئیکرام)[1] وتی: لەسەردەمی کێماڵ و لەشکرکێشی حیزبی بەعسی سۆشیالیستی، زۆر شتی خەفەتئامێزو ترسناکمان بینی، کە زمان و قەڵەم ناتوانێ دەریبڕێ و بیخاتە سەر کاغەز.

لە میانەی ڕاکردن و تەیکردنی دەشت و چیاو دۆڵەکانی قەرەداغ و گەرمیاندا کوڕێکم بینی پیرەژنێکی پیروکەنەفت و داماوی بەکۆڵەوە بوو، پیرەژنەکە هەر بە قوربانی کوڕە گەنجەکە دەبوو، دەیوت: کوڕە بە قوربانت بم من لە بن بەردێکدا بەجێ بهێڵەو خۆت دەرکە! واز لە من بێنە با تۆش بەهۆی منەوە تیانەچیت، کوڕە خۆشەویستەکەم (کزەی جەرگەکەم) من تەنها مردنم ماوە، با من بمرم و تۆ هیچت بەسەرنەیەت. کوڕەکەش هەمو جارێ قسەکەی لە دەمی دایکی دەسەندەوەو دەیوت: دایەگیان بەخوا سەری خۆم لە پێناوتا دادەنێم، چۆن بەجێتدەهێڵم! بەخوا یان ڕزگارت دەکەم یان دەبێ منیش لەگەڵ تۆ ئەنفال بکرێم، دواتر بیستمەوە ئەو کوڕە لە قۆپی قەرەداغەوە دایکی بە کۆڵ بردۆتە گەرمیان و دەڤەری سەنگاو، ئیتر لەوێ لەگەڵ دایکی بەیەکەوە بەر شاڵاوی ئەنفالی حیزبی بەعس کەوتبوون.

ئەم شێرەکوڕە بەڵێنەکەی لەگەڵ دایکیدا کردبووی بردیە سەر، خۆی کردە فیدای و قوربانی دایکی و سەروگیانی خۆی لە پێناوی دایکیدا دانا.

---

[1] شێخ ئیکرام (خەڵکی گوندی بەڵخەی قەرەداغ)ە .

# دایك هەمیشە خەمخۆرە

کەسانێك بە مردن ئاسودە دەبن، پشوی خۆشی ئەوان و خۆشیەکانیان لەدوای مردنەوە دەست پێ دەکات، بۆیە زاناو خواناسەکان لە ژیانی دونیادا زۆر خۆیان ماندو کردوەو کە داوای پشویان لێکراوە، وتویانە: خەوو پشو بۆ ناو گۆڕە، ماوەیەکی زۆرمان لەبەر دەستدایە بۆ خەوو پشودان، لە ڕۆژی مردنەوە تا ڕۆژی زیندووبونەوە، بەڵام کەسانی خراپەکار ناخۆشیەکانیان لەساتە وەختی مردنیانەوە دەست پێ دەکات.

موسوڵمانی ڕاستەقینە هەرچەند لە ژیانی دونیادا لە خۆشیدا بێت لە چاو خۆشی ژیانی ناو گۆڕو دواڕۆژدا وەکو بەندیخانە وایە، بێ باوەڕو خراپەکاریش هەرچەند لە ژیانی دونیادا لە ناخۆشی و تەنگانەدا بێت لە چاو ژیانی ناوگۆڕو دواڕۆژیدا وەکو بەهەشت وایە.

کاك سەرداری مەلا ڕەحمان بەسەرهاتی مردنی دایکی بۆ گێڕامەوە وتی: (١٥) پانزە ساڵ لەسەر جێگە زەلیل و کەنەفت بوو، بەردەوام بەدەم دەرد و ئازارەوە دەیناڵاند، بەردوامیش وەسیەتی دەکرد (کە مردم یەك شەو تەرمەکەم لەمزگەوت بهێڵنەوە ئەسپەردەم مەکەن، با ئەو شەوە لەماڵی خوادا بحەسێمەوەو پشویەك بدەم، تۆزێ ماندویەتی ئەم چەند ساڵەم دەرچێت)، لەسەعات دوانزەی شەوی هەینی ٢٢/٢٣-١-١٩٩٤ گیانی دەرچوو، ئیتر ئەو شەوە لە مزگەوت تەرمەکەیمان داناو بە ئاواتی خۆی گەیشت، ناڵەو نرکەو ئێش و ئازارو ژانی چەندین ساڵەی لە لەش

دەرچوو، ئەو شەوە بەبێ ئازارو هاوار لەگەڵماندا بەسەر برد دوای پانزە ساڵ نەخۆشی.

بەڵام وادیارە دایك دوای مردنیش دڵ و گیانی هەر لای منداڵەکانیەتی، ئەم خوشکە بەڕێزەش دوای مردنی تازە سەرداری کوڕی نەخۆشیەکەی سەری هەڵدابوو، سەرەتا تەنها خۆی زانیبوی کە دوچاری ئەو نەخۆشیە بووبوو، بەڵام لەو کاتەدا دووکەس یەکێك لە سلێمانی و ئەوی تر لە لەندەن خەویان بە حاجی قەمەرنازی دایکی کاك سەردارەوە بینیبوو، زۆر بەبێ تاقەتی و خەفەتباری بینیبوویان، ئەوەیان کە لەبەریتانیابوو لەخەویدا وتبوی حاجی قەمەرناز بۆ واخەفەتبارو بێ کەیفی؟ وتبوی: لەتاو نەخۆشی سەرداری کوڕم.

ئەم خوشکە خواناسە پێش مردنی قاپێکی لە ماڵی دراوسێیەکی هەتیوباریان خواستبوو، کاتێك نەخۆشیەکە تینی سەندبوو لەبیری چوبوەوە بە منداڵەکانی بڵێ قاپی ماڵە هەتیوەکە بەرنەوە، دوای مردنی چوبوە خەوی خزمێکیان و پێی وتبوو بە منداڵەکانم بڵێ با ئەو قاپە بەرنەوە بۆ ماڵی ئەو هەتیوانەی دراوسێمان.

بەڵێ کە خزمەکەمان خەونەکەی گێڕایەوە، لە دراوسێکەمان پرسی، وتیان: ڕاستە قاپێکی ئاواو ئاوای لەماڵی ئێمە خواستوەو نەیهێناوەتەوە ئیتر دەستبەجێ قاپەکەمان بۆ بردنەوە.

کاك سەردار وتی: نەنکیشم وەسیەتی کردبو کە مرد هەر دەبێ دایکم تەرمەکەی بشوات، بەڵام مردنی دایکم پێش ئەو کەوت و نەنکم پێنج ساڵ دوای دایکم مرد.

یەکەم ڕۆژی پرسەی دایکم مامۆستا محمد "ناسراومان"هات بە دوای دایکمدا، دایکی وەسیەتی کردبوو کە مرد دایکم (حاجی قەمەرناز) بیشوات، ئەو شەوە دایکی مامۆستا محمد کۆچی دوایی دەکات، دەمەو بەیانی زوو دێت بۆ ماڵی ئێمە بەدوای دایکمدا، کە دێت ئەو قەرەباڵغیە دەبینێت لەبەردەم ماڵی ئێمەدا، دەڵێ: ئەوە چی یە؟ دەڵێن: حاجی قەمەرناز مردوە، ئەویش دەڵێ: دەوەاللە دایکم وەسیەتی کردوە ئەو تەرمەکەی بشوات منیش هاتوم بەدوایداو نەمزانی ئەویش مردوە.

## نزاکەی دایکم وەك فیشەك پێکامی

کاك دانا[1] لە ماڵی خۆمان بۆی گێڕامەوە، وتی: میوانمان هەبوو دایکم زۆر سەرقاڵ و مەشغوڵ بوو، منیش گەورە بووم بەڵام هیچ هەڵنەستام یارمەتیەکی دایکم بدەم، چەند جاریش لێی دووبارە کردمەوە، لە سەر کورسیەك دانیشتبوم ولاقم درێژکردبوو بەسەر تەپڵەکێکدا قاچم ڕادەژاند ومێشیش میوانم نەبوو، دایکیشم دوای ئەوەی چەند جار وتی: وەرە ئیشێکم لەگەڵ بکە، هەر نەچووم، وازی لەوە هێناو نائومێد بوو کە ئیشی لەگەڵ بکەم، ئینجا دەیوت: کاکە دەی وەکو ئیشم لەگەڵ ناکەیت قاچ بەسەر سفرەکەدا ڕامەژێنە، خۆ تۆ دەردت نیە، بە خوا گوێم بۆ نەگرت وبە گوێشم نەکرد، لە کۆتایدا دایکم پەتی خۆڕاگری پسا، وتی: دەك یاخوا توشی دەردێك بیت ئاوا لاقت ڕاژێنی.

---

[1]–کاك دلنا کوڕی کاك محمود ڕیش سپی گوندی هەڵەدنە .

ئینجا کاتی نانخواردن هات و هەر لەگەڵ لەنانخواردن بوینەوە، باوکم وتی: هەستە کاکە دانا بابڕۆین بۆ سەرخەرمان ئیشمان هەیە، لەگەڵی ڕۆیشتم و بەگەیشتنی سەر خەرمانەکە مارێك بە پەنجەی قاچیەوەدام، خێرا گەیاندیانمە ماڵەوە بۆ لای پزیشك وحەکیمی ئەو کاتە، دوای تەداوی وتیمارکردن، وتیان: بەپەتێك قاچی بۆ هەڵبەستن وبا قاچی ڕاژێنێت بەڵکو ژانەکەی کەمبێتەوە، کاتێك قاچیان بۆ هەڵبەستم وقاچم ڕادەژاند دوعاکەی دایکم بیرهاتەوە، کە یەك دوو سەعات لەوەوپێش وتی: یاڕەبی توشی دەردێك ببیت بە ڕاستی ئاوا قاچت ڕاژێنی وەك چۆن ئێستا بە بێتاقەتی قاچت ڕادەژێنی وبە گوێم ناکەیت، ئیتر دوعاکەم بیرهێنانەوە، دایکم لە دوعاکردنەکەی پەشیمان بوو، وخەفەتی زۆریشی خوارد.

## بۆ مردنی کوڕەکەی نوێژەکەی نەفەوتاند

پێغەمبەر (صەلات و سەلامی خوای لەسەربێت) فەرمویەتی: لە ڕۆژی دواییدا حەوت کەس لە ژێر سێبەری خواییدان، کە لەو ڕۆژەدا هیچ سێبەرێك نیە جگە لە سێبەری خوا، یەکێکیان گەنجێکە کە بە ئیسلام گۆش بوبێت، کاکە سورکێو گەنجێکی جوانی نورانی فریشتە ئاسا، قورئانخوێن، دەستپاك، داوێنپاك، ڕۆژوگر، بەردەوام لە مزگەوت و ڕیزی نوێژدا، قوتابی قورئان لە شاری سلێمانی. شەوی ١٢/١٣ - ٢ - ١٩٩٨ لەدوای نوێژی خەوتنان لە مزگەوت وتی: باوکم دەڵێ دەبێ لەگەڵمان بێیت بۆ سەیران، منیش دڵی باوکم پێ ناشکێت وحەزیش ناکەم

دەرسەکەم بفەوتێنم، بەهەرحاڵ مۆڵەتم لە مامۆستا بۆ وەرگرن بۆ بەیانی دەڕۆین بۆ سەیران.

لە قەشقۆڵی دوکان لادەدەن، کاکە سورکێوی خواناس هەڵدەستێت نوێژی چێشتەنگاو دەکات، سورەتی (الکهف) بۆ برایەك دەخوێنێت تا هەڵەکانی بۆ ڕاست بکاتەوە، لەگەڵ تەواوبونی (الکهف) منداڵێك دەکەوێتە ئاوەکەی قەشقۆڵیەوە، سورکێویش بۆ ڕزگارکردنی منداڵەکە خۆی هەڵدەداتە ئاوەکەوە، منداڵەکە ڕزگاری دەبێت وسورکێو خۆی دەخنکێ، دوای هەژدە ڕۆژ تەرمەکەی دۆزرایەوە، کە هێنایانە مزگەوت شۆردمان و دامانناتا باوکی بگەڕێتەوە، کاتی نوێژی خەوتنان بوو باوکی سورکێوی شەهید[1] هاتەوە، لەبەر فریاکەوتنی نوێژە جەماعەتەکەی نەچووە سەر تەرمی کوڕەکەی، بەڵکو سوپاس وستایشی خوای کردو یەکسەر نوێژەکەی دابەست، دوای تەواوبونی نوێژەکە ئەوسا چووە سەر مەیتەکە وناوچەوانی کوڕەکەی ماچ کرد.

---

[1]- پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (..الغریق شهید ..)، واتە: ئەو کەسەی لە ئاودا بخنکێت شەهیدە .

# سەری بێ رۆزی لەژێر خاکدایە

خەڵکی ورەبەرزی کوردەواری خۆمان هەر ئەوەندەی ئەم ژەمە تێربوون خەمی ژەمێکی تریان نەبووە، بڕوای تەواویان هەبووە کە سەری بێ ڕۆزی لەژێر خاکدایە، و بژێوی هەموو دروستکراوەکانی وبەخێوکردنیان بەدەست خوایەو لەسەر خوایە، ئەوەی پێویستی بەخۆراك هەبێت خوای گەورە رۆزی و بژێوی بۆ دروستکردوەو بۆی دیاریکردوە، هیچ زیندویەك بەشی مردویەك ناخوات وهیچ مردویەك پاروێك لە ئەندازەی دیاریکراوی خۆی کەمتر ناخوات، لە کوردەواری خۆماندا وتراوە: کەس پاروی کەس ناخوات پاروی خۆشی نادات بەکەس[1].

برایەکی بەڕێز ڕۆژی ٢٠١٢/٢/٩ تەلەفونی بۆ کردم و خۆی پێناساندم، وتی: من بەسەرهاتێکی خۆشم لەلایە کە بەچاوی خۆم بینیومە، حەزدەکەم لە زنجیرەی بەسەرهاتەکانتدا تۆماری بکەیت، هەتا پارێزراو بێت و کەسانی ژیرو داناش پەندی لێ وەرگرن.

(کاك موحسین)[2] وتی: لەساڵی ١٩٨٩ بۆ ساڵی ١٩٩٠ لە تانجەرۆ دەلاك بووم، لە نزیك سەربازگەیەك (معسكر قتال)، گوێدرێژێك لە ناو سەنگەر (موضع)ێکی سەربازیدا زاو بێچویەکی بوو، چەند کەسێك هاتن کە

---

[1]-بەسەرهاتی سەرسوڕهێنەر لەم بارەیەوە لە (بەرگی یەکەمی) کتێبی (پایزە برای) نوسەردا بخوێنەرەوە، لاپەڕەکانی: (٢٥، ٢٧، ٢٩، ٣١، ٣٥، ٣٩).

[2]-کاك محسین: کوڕی مەلاصدیقی ڕەنگینەیە، هاوڕێی مامۆستا (عثماني شێرە)یە لە سلێمانی، ڕەنگێنە گوندێکە لە شارباژێر – سلێمانی.

گوێدرێژەکەیان بینی بەزەییان بۆی جولاو بەهەرحاڵ خۆی و بێچوەکەیان هەڵکێشایە دەرەوە، دوای سێ ڕۆژ گوێدرێژەکە تۆپاو جاشولکەکە بەبێ دایك مایەوە، گژوگیاو پوش و خواردنیشی بۆ نەدەخورا، چونکە سێ ڕۆژانەبوو، بەڵێ من (کاك موحسین) بەچاوی خۆم هەموو ڕۆژێ دەمبینی سەگێك لە وڵوبەوە[1] دەهات و لەبەردەمی جاشولکەکەدا لەسەر پشتدەکەوت و ڕووی دەکردە ئاسمان، قاچی بڵاو دەکردەوەو جاشولکەکەش تێی هەڵدەکەوت و گوانەکانی دەمژی، هەتا تێری دەخوارد، ئیتر کە دەمی لە گوانی سەگەکە دەکردەوەو دێڵە سەگەکە هەڵدەستاو ملی ڕێگەی دەگرتەوە بەرەو وڵوبە، ودووبارە بەیانی دەهاتەوە، هەتا ئێمە لەوێ بوین جاشولکەکە گەورەبوو، ئەوسەگەمان دەبینی هەموو ڕۆژێ ئەوە کاری بوو، لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا دەهات و لە دەوامی خۆی دوا نەدەکەوت!

## خودا بەشی هەرکەسێکی لە یەکەم ڕۆژی ژیانیەوە دیاریکردووە، هۆکاریش دەڕەخسێنێ

لەماڵی خزمێکمان سێ چوار ساڵ پێش ئێستە دەعوەت بوین، باسێکی گێڕایەوە هەر زۆر سەیر،! وتی: چوین بۆ سەلاحەدین تا لەوێوە بچین بۆشەقڵاوە بۆ سەیران، لەدوای نەوەدەکان، ڕاستتر دوای ساڵی (١٩٩٣)

---

[1]-گەڕەکێکی دەرەوەی شاری سلێمانیەو نزیکەی سێ کیلۆ مەتر دورە لە شوێنی جاشولکەکەوە.

چوین بۆ ئەوێ، عەرەبیش هاتبون بۆسەیران، ئەم پیاوەی خزممان کوڕێکی هەبووە لە گەڵ کچێکی عەرەبدا چاویان هەڵتۆقیوە بەیەکدا، ئەو بەدزی باوکیەوەو ئەم بەدزی باوکیەوە، ئیتر کوڕو کچەکە وەعدو پەیمانێکیان بەیەکەوە بەستووەو ئەو وتویەتی: تۆ ناوت چیە؟ ئەم وتویەتی: تۆ ناوت چیە؟ ئیتر ئەدرەس وناوونیشانی یەکتریان وەرگرتووە و هاتونەتەوە، کەهاتونەتەوە پاش ماوەیەك مامۆستا وتویەتی ژنی بۆ دێنم.

کاتێك مامۆستا عبدالله (باوکی کوڕەکە) دەڵێت: ژنت بۆ دێنم، کوڕەکەش دەڵێ: ژنی چی؟ وازم لێبێنە، مامۆستا چوزانێ عەشق و ئەوین کاری تێکردووە و بەشێوەیەکی زۆر کاریگەر و سەیر.

ئینجا دوای ئەوە لای براکەی قسەی کردووە وبراکەشی هاتووە قسەی بۆ باوکی کردووە، باوکیشی خەریکبوە تێکبچێ، چۆن شتی وا ئەبێ کچێك لەکەربەلا بێ، وکەربەلا لە کوێ، وبەحەیاتی ئەو ڕۆژە بینیویەتی.

ئەم سەر وئەو سەر تەکلیفێ زۆریان لەمامۆستا کردووە و تا مامۆستا بچێت بە دەم ئەم مەوزوعەوە، مامۆستا پێیان دەڵێ: بابە ئاخر مەعنای تیا نیە من لێرەوە بڕۆم وئادەی فلان ماڵ لەکوێیە؟ من مەلایەکی کوردی سوننی و ئەو شیعە، ئاخر ئەمە هەر زۆر سەیرو سەمەرەیە .

ناچاریان کردم هەڵسام لە بەر ئەم کوڕە لەگەڵ کورەکەی ترمدا چوین بۆبەغدا، ئیتر ئایا لە سەیارەدا بووە یان نا، کۆمەڵێك جوندی دایان بەلاماندا، یەك دوو جوندی دابەزین وهەردووباڵیان گرتم وسوار سەیارەیان کردم (سەیارەی جێپ قیادە)، گرتیانین و بردیانین، لەگەڕەکێك لە

گەڕەکەکانی بەغدا لایاندا، ئیتر ئەفسەرەکە پێش خۆی داین، بردینیە ماڵەکەوە، سەیر ئەکەین ماڵی خۆیانە، لەوێ کابرای ئەفسەر ڕووی کردە کوڕی مامۆستا وتی: (ها ما تعرفنی)؟ ئیتر بۆی باس کردووە کەکاتی خۆی بەیەکەوە عەسکەر بوون، دوای ئەوە خزمەتێکی باشی کردوون و لێیپرسیون بۆچی هاتوون؟ بۆ گەیشتوونەتە ئێرە؟ ئەوانیش وتویانە: بۆ شتێك هاتوینەتە ئێرە کەڵکی باسکردنی نیە، وتویەتی: چیە؟ مامۆستاش وتویەتی: حاڵ لەمەو حیکایەت لەمە، مەسەلەیەکی وایە. کێیە؟ کێ نیە؟ باسیان کردوە بۆی، ئەویش وتویەتی: هۆو خۆ وەڵڵا ئەوە (شیخ العشیرة)یە، چۆن؟ بەرەوەڵڵا! منیش کوڕی (شیخ العشیرة)یەکی ترم، ئەم کارە هەر زۆر ئاسانە بەدەست باوکمە .

ئیتر بەیانی هەستاین لەگەڵ باوکما ڕۆیشتین، دووەم جاریان بووە کەبچن بۆ پرسەو تازیەیان، ئیتر کاتێ ڕۆیشتین سەیر دەکەن ئەو مەلایەکی کوردە، ئیتر لەوێ دانیشتین و قسەوباس کرایەوەو بێ سێ ودوو دوای باسکردنی، وتیان: با پرسوجۆی خۆمان بکەین جوابتان ئەدەینەوە، دوای جوابیان دابونەوە ووتوبویان: ئێمە مەرجێکمان هەیە خەڵکی سلێمانی ڕووت وسفوری زۆر تیایە، داواتان لێ ئەکەین کەنەهێڵن کچەکەمان ڕوت بێتەوە.

وتی: قەدەری خوا وابوو دوای ئەوە تازیەیەکی تریان هەبو، مامۆستاش عەرەبیەکی باشی دەزانی، وتی: یەك وتاری زۆر باشی بۆدان، ئیتر بەو وتارە ئەوەندەی تر هەڵسانەوەو بەتەواوی دەرکەوتین، دوایی کچەکەیان پێداین و هێنامان بۆ سلێمانی، پێم وابێ وتی: بە قاچاخ هێناومانە چونکە ئەو کاتە زۆر زەحمەت بووە.

# بیخۆ ڕزقی خۆتە

لە زاری مامۆستا مەلا ئەحمەدی قامیشیەوە بیستومە:

کەس ڕزقی کەس ناخواو هەرچی خوا بۆتی دانابێ دەبێ ببێ، مەلامەجیدی قامیشی دەگێڕێتەوەو دەڵێ:ماڵی قازی محمەدی بێتووش مریشکێکی قەڵەویان هەبوو، قازی ئەڵێ: لەناو خێزانەکەمدا خەریك بووین مریشکەکەمان دەگرت بۆ ئەوەی بۆئەو ژەمە سەری ببڕین، لەو کاتەدا میوانێك لە دەرگایدا، منیش لەبەر پێشوازی لە میوانەکە ئاگام لە مریشکەکە نەما، ئێوارە کە نانوچێشتمان بۆ هات بەتەمابووم گۆشت مریشکی لەگەڵ بێت، بەڵام خواردنەکە سادەو بێگۆشت بوو! دیار بوو مەلاژن لەبەر میوانەکە حەزی نەکردبوو سەری ببڕێت ونەیویستبوو ئەو لێی بخوات.

بەڵێ دوای چەند مانگێك هەمان مریشکمان بۆ خۆمان سەربڕی، کە ئێوارە نان دانرا هەر هەمان ئەو پیاوەی وەختی خۆی کە حەزمان نەکرد مریشکەکەی بۆی سەربڕین لێی بخوات، لەکاتی نان خواردندا خۆی کرد بە ماڵدا، منیش کە خواردنەکەیان هێنا بە گۆشتەوە، وتم: فلانی بیخۆ ڕزقی خۆتە نۆشی گیانت بێ، ئیتر بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە.

# وادەی مردن پاش و پێش ناکات

کاتی دیاریکراوی مردن (ئەجەل) بە هەناسەو چاوتروکان پاش و پێش ناکات، لە شوێنی دیاریکراویشی بە مو کەموکورت ناکات و تێناپەڕێت، چونکە کات و شوێنی مردن نەخشە داڕێژراوو کێشراوی خواییەو نابێ کەم و زیاد بکات، بە هیچ جۆرێك و هەرگیز گۆڕانکاری بەسەردا نایەت، هەر کەسە لەهەرکات و لەهەرکوێ وادەی مردنی هاتبێت دەبێ بەپێی خۆی و بە ویستی خۆی، بگرە بەخۆشحاڵی یان بە ناچاری و بە پارەو ماڵی خۆی پەلە بکات هەتا خۆی بگەیەنێتە ئەو شوێن و کاتە.

لێرەدا ئەو بەسەرهاتەم بیرهاتەوە، هاوڕێیەکی بەڕێزم[١] بۆی گێڕامەوە وتی: لەساڵی ١٩٨٧ چومە شاری موسڵ بۆ سەردانی برادەرێکم بەناوی (کاك شیروان مەلا عزیز صحاف)، لەگەڕانەوەمدا بۆ بەڕێکردنم لەگەڵمدا هات بۆ گەراج، لەگەراج سواری تەکسیەك بووم بۆ سلیمانی، پێش ئەوەی بەڕێبکەوین شۆفێرەکە چوو بلیت ببڕێت، ئافرەتێك پەیدابوو وتی: ئەم تەکسیە بۆ سلیمانی دەچێت؟ ئێمەش وتمان: بەڵێ، بەڵام قەپات بوەو جێگەی نەماوە وئێستا دەردەچین بۆ سلێمانی، ئافرەتەکە زۆر پاڕایەوەو تکاو ڕجای کرد وتی: یارمەتیم بدەن وەکو دایکی خۆتان، چونکە دەبێ هەر ئەمشەو بگەمەوە سلێمانی کوڕێکم زۆر نەخۆشە، ئینجا ئێوەش پیاون شەویش بە ڕێگاوەبن ئاساییە، نەفەرەکان سیانیان بەیەکەوە بوون، وتیان: ئێمە بەیەکەوەین ئەگەر یەکێکمان دابەزین ئەبێ

---

[١]-کاك ڕزگار: وەستای چادرو خێمەیە لە بازاڕی مەزادخانەی خوارەوە لە سلێمانی.

هەرسێكمان دابەزین و بەجیا ناڕۆین. یەکێکی تریشیان وتی: بەخوا منیش کاری زۆر بەپەلەم هەیەو نابێ دواکەوم، تەنها من مامەوە، منیش زۆر بەزەییم پیاییدا هاتەوە، بڕیارمدا دابەزم وئەو لە جێگەی من بڕوات، هاوڕێکەم وتی: ئەوە دابەزییەوە؟ وتم: بەڵێ یارمەتی ئەو ئافرەتەمدا زۆر بەزەییم پیاییدا هاتەوە، وتی: دەی باشە ئەگەر سەیارە نەبوو ئەمشەویش لامان بمێنەوە.

پاش نیو سەعات سەیارەیەکی تەکسی پەیدابوو، خێرا پڕیوو لەنەفەرو بەڕێکەوتین، کە گەیشتینە ئاسکی کەڵەك قەرەباڵغیەکی زۆر لەسەر جادەکەبوو، کاتێك دابەزین ئەو تەکسیە وەرگەڕابوو کە من لێی دابەزیم و ئافرەتەکەم لە جێی خۆم سوارکرد.

ئەوەی جێی داخ و خەفەت بوو تەنها ئەو ئافرەتە مردبوو کە بەهەڵەداوان و بەپەلە سوار بوو ومنی دابەزاند، بۆ ئەوەی فریای کوڕە نەخۆشەکەی بکەوێت.

کابرای سایەقیش ڕوی کردە من وتی: توخوا تۆبۆ دابەزی و ئاوا ماڵی منت وێران کرد، وتم: کاکە بەدەست من نەبوو من ئەجەلم نەهاتبوو، ڕۆژی ئەو خوشکە تەواو بووەو بەدەست من نیە.

# تا بەردەکەم نەخستە سەرسنگی گیانی دەرنەچوو

مامۆستا مەلا محمد[1] بۆ منی گێڕامەوە: پیاوێکی جاف بەناوی (......) بۆی گێڕامەوە لە لادێ لەگەڵ کەسێکی خەڵکی لادێکە قسەیان تێکدەگیرێت، دوای لێك سوربونەوەو جوێن و قسە بەیەك وتن شاڵاو بۆ یەکتر دەبەن، دەڵێ: کابرای ناسیاوم مام (.......) وتی هەر داهاتمەوە ویستم بەردێك هەڵگرم بەکابرای کێشم، بەردەکەش هەروەکو خۆی هەڵداتە ناو دەستمەوە باوەڕتان هەبێت پێش ئەوەی دەستم بیگاتێ بەردەکە کەوتە ناو دەستمەوە، منیش لەو ڕوداوە هەڵسڵەمیمەوەو شەیتانم بە لەعنەت کردو بەردەکەم پێنەکێشا، ئیتر خەڵك وخزم ودۆست کەوتنە نێوانمان و دەستیان گرتین، بەڵام بەردەکە هەر لەدەستمابوو، منیش خستمە گیرفانمەوە، ساڵ هاتن و ساڵ ڕۆیشتن ئەم بەردە هەر لای من مایەوەو بۆخۆشم نەمدەزانی ئەم بەردە بۆ فڕێ نادەم و هیچ کارێکیشم پێی نەبوو.

دوای چەند ساڵ ئەو پیاوەی کە لەگەڵیدا شەڕم بوو نەخۆشکەوت و ئێمەش هیچ لە نێوانماندا نەمابوو، هاتوچۆو سەردانمان هەبوو، کاتێك زۆر پەکی کەوت و چەند ڕۆژ بە گیانەڵاوە بوو، هەموو هەناسەیەکی دەیان وت: ئەوا گیانی دەرچوو، بەڵام هەر نەدەمرد، هەر لەو نەخۆشی سەرەمەرگ و ئێش و ئازارەدا دەتلایەوە، منیش وەك ئەندامێکی

[1]—ناسراو بە (مامۆستا محمدی ناڵی) پێش نوێژ لە مزگەوتی ناڵی لە سلێمانی شەوی سێ شەم ٦/٧– ٢ – ٢٠١٢ .

گوندەکەمان چومە سەردانی، ویستی خوا وابو لە ماڵەوە کە هاتبوم بەردەکەی چەند ساڵ لەوەو پێش ویستم پێی کێشم ودواتر بە نسیبی نەبوەو منیش بەبێ ویست و بیرلێکردنەوە هەر هەڵم گرتبوو لەماڵەوە، نازانم چۆن کەوتبوە بەرچاوم هەڵم گرتبوو بەبێ ئاگایی خستبوومە گیرفانمەوە، کە لەلای نەخۆشەکە دانیشتم دەستم کرد بە گیرفانمدا، بەردەکە کەوتە دەستمەوە دەرمهێناو سەرێکم ڕاوەشاندو وشەیەکی سەرسوڕمانم وت، دەستم درێژ کرد بەردەکەم خستە سەر سنگی پیاوە نەخۆشەکە، لەگەڵ سەنگ و قورسایی بەردەکە کەوتە سەرسنگی نەخۆشەکە یەکسەر گیانی سپاردو یەك هەناسەی تری نەدا، ئیتر هەناسەیەکم هەڵکێشاو وتم (سبحان الله)، بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕانەوە، وتم: ئەمە ئەو بەردەیە کە وەختی خۆی پێش چەندساڵ کە شەڕمان بوو ویستم پێیدا بکێشم، بە ویستی خوا هەر لەلام ماوەتەوە تا ئێستا، ئەوا دەوری خۆی بینی.

# مردنیش کاتی خۆی هەیە[1]

لەساڵی ١٩٩٨ چومە گوندی قولقوڵە لەدەوروبەری شاری مەریوان، بۆ سەرەخۆشی و پرسەو دڵدانەوەی دۆستێکم بەناوی حاجی محمد، قسەیەك بۆ ئەو بۆنەیە بشێ کردمان وتمان: یەکەم: مردن بەئەجەل وکاتی دیاریکراوی خواییە وکەس دەسەڵاتی تیایدا نیە، دووهەم: سوپاس بۆ خوا نۆ کوڕی ترت هەیە. سێهەم: سوپاس وستایشی خوای دەوێت کە کێشەو گرفتی بە دواوە نیە.

حاجی محمدیش وتی: من موسوڵمانم ڕازیم بەو کات وئەندازە وتەمەنەی خوا بۆ کوڕەکەمی داناوە، بڕواشم وایە کوڕەکەم توشی بەڵای گەورەتر بوود، بەڵام خوا بۆ ئەم ڕۆژەی هەڵگرتوە ومنیش ڕازیم بەقەدەری خواو ناشکوری ناکەم، ئەم کوڕە کە ئێستا مردووە لە سکی دایکیدا بوو، شەوێك باران زۆر باری، ئێمەش هەر لەم خانوەدا بووین، شەو چوومە سەربان بۆ بانگێڕان، خێزانیشم لەگەڵمدا هاتە سەربان ولە قاتی دووهەمەوە کەوتە خوارەوە، منیش خێرا ڕامکرد هەڵمگرتەوە، وتم: خۆشی نەمردبێ مناڵەکەی لەبار چوە ومردووە، کاتێکیش چومە سەری تەنها نرکە وناڵەی دەهات، دواتر چاکبوویەوە، مناڵەکەش بە ساغ وسەلامەتی لە دایك بوو ناوم نا (ئەمین).

کوڕە گەورەبوو، بووە خاوەن ژن ومناڵ، لەم ڕۆژانەدا لەناو ئاواییدا پرسەیەك هەبوو بەیەکەوە چوین بۆ پرسەکە، بەپەلە مناڵێکمان هەواڵی

---

[1]– مامۆستا مەلا عوسمان شێرە بۆی گێڕامەوەو بۆی نوسیم.

هێنا وتی: باوکە بارمان بۆ هاتوە، کاکە ئەمین وتی: باوکە تۆ دانیشە من ئەچم تۆ عەزیەت مەکێشە، تەنها دوای پانزە خولەك یەکێك لە منالەکانم هات و وتی: باوکە فریاکەوە کاکم مرد، کە گەیشتمە لای کاکە ئەمین بەبێ بوونی هیچ نەخۆشیەك مردبوو، تەنانەت بەقسەش نەیگەیشتمێ .

## خوا لەگەڵ خۆڕاگراندایە

خۆڕاگری و پشودرێژی و خۆگری خەسڵەت و سیفەتی پێغەمبەرەکان و سەرکردەو زاناکان و خواپەرستە گەورەکانە. هەر کەس بە خۆگر وەسف بکرێت خەڵکی بە کەسێکی ئازاو لەسەرخۆو گەورەو سەرکەوتووی دەزانن. خۆگری دەبێتە هۆکاری سەرفرازی دونیاو دوارۆژ، خوا لەگەڵ خۆگرەکاندایەو خۆشیدەوێن و پشتگیریان دەکات و لەلایەن فریشتەو ئادەمیزادو جنۆکەو پەریو تەواوی دروستکراوەکان خۆشەویستیان دەکات.

خوا پلەو مەقامی پێغەمبەرەکان و خەباتگێڕەگان و زاناکان و خواپەرستەکانی پەیوەست کردووە بە خۆگری و پشوودرێژیەوە بەهۆی خۆڕاگری دونیاییەوە، خوا وادەو بەڵێنی پلەو پایەو سەرفرازی و بەهەشتی دوارۆژی پێداون. خۆگرەکان لە دونیادا گەورەن بۆیە لە دوارۆژدا خوا شوێن و مەنزڵگەی شکۆدارانیان پێدەبەخشێ.

دەچینەوە یەکێك لە گوندەکانی کوردستان بزانین سەبرو خۆڕاگری چ داستانێکی لە گوندی قامیشی شاربازێر لە مێژوودا تۆمارکردوەو

پێشکەشی ئێمەو نەوەی داهاتوی کردووە، لە ٢٠١٢/٦/١٨ چوینە سەردانی ماڵی ناسراوێکم بۆ سەرەخۆشی کردن، بەبۆنەی خنکانی دوو کوڕی گەنجی جەوانی خزمیان لە تەمەنی ١٩ساڵ و ٢٣ساڵیدا، دوای دڵخۆشی دانەوەو سەرەخۆشی و گێرانەوەی چەند بەسەرهاتێك بۆ دڵدانەوەی ئەوان، خێزانی مام فتح الله وتی: مامۆستا گیان بەقوربانتان بم خۆ ئێمە ئەمە یەکەم کارەساتمان نیە، بەخوا من منالێکی هەرزەکار بووم بە بیرم دێت ئافرەتێکی خزممان دوو کوڕی جوانی هەبوون بەناوی عومەرو عوسمان، دوو کوڕی گەنجی جوانی شۆخ و شەنگ، دەتوت: خەلفەنەمامی تازە بەهارن، هەر حەزت دەکرت لە بەژن و باڵایان بڕوانی، یەکێکیان نەخۆشکەوت، وتیان: گرانەتایەتی دوای چەند ڕۆژێك کوڕە مرد.

خزم و دۆست تەواوی خەڵکی گوندەکە بۆی لە پەرۆش بوون، بەڕاستی خەم و پەژارە گوندەکەی داپۆشی، هەموو کەس وەکو کۆرپەی ئازیزی خۆیان لەدەستدابێ، بەڵی ئاویان گەرم کرد تەرمی کوڕە بەژن و باڵا لاولاویان هێنا بیشۆرن، نازانم چۆن وەسفی جوانی و شۆخ و شەنگی و هەڵکەوتووی ئەو کوڕە بکەم، یاخوا هیچ دایك و باوکێك کۆرپەی خۆیان ئاوا نەبینن، لەو کاتەدا "دادە ئامینە"دایکی کوڕە مردووەکە کە ناسراوبوو بە "ئامینەی صالحی هەمزە" هاتە پێشەوەو قۆڵی هەڵماڵی، وتی: بەخوا تەرمی کوڕی خۆم بەدەستی خۆم دەشۆم، زۆریان لەگەڵ وت: ملی نەدا، بەڵی جوان جوان تەرمەکەی بەگوێرەی شەرع شۆردو کفنی کرد، ئیتر هێمن و لەسەرخۆ بەدەم یادی خواو نزاو پارانەوە ڕۆیشت خۆی شۆرد، و هات چەند ڕکاتێك نوێژی کردو هەردوو دەستی بەرزکردەوە،

بەدەنگی بەرز لەناو خەڵکەکەدا وتی: خوایە! ئەوە کوڕەکەمە کە بە ئەمانەت دابووت بە من و بەمنت سپاردبوو، ئەوا بە پاکو خاوێنی و بەجوانی تەسلیمی تۆم کردەوە، و دەبڕۆ کوڕە شیرینەکەم خوا حافیزت بێت و خوات لەگەڵ.

بەڵێ دوای ماوەیەکی تر کوڕەکەی تریشی هەمان نەخۆشی گرت، پاش ماوەیەك ململانێ لەگەڵ نەخۆشیەکەی ئەویش مردو نەخۆشی ئەویشی لە ئەرزی دا، جا نازانم چۆن باسی خەمو پەژارەی تەواوی خەڵکی گوندەکە بکەم، نازانم چۆن وەسف و سەنای جوانی و هەڵکەوتووی ئەو دوو تازە لاوە بکەم، دووبارە دادە ئامینە خۆگرو هێمن و لەسەرخۆ بە بێ ئەوەی کەس تەنها ناشوکریەك یان هاوارو ڕۆڕۆیەکی لێ ببینێ، بەهەمان شێوەی کوڕەکەی پێشووی دەم بە زیکرو یادی خواو پاڕانەوە سوێندی خوارد کە تەرمی ئەم کوڕەشیان هەر خۆم دەیشۆم، تەرمی ئەم کوڕەشی بەدەستی خۆی شۆردو کفنی سپی لەبەرکردو دواتر خۆی شۆرد، چەند ڕکاتێك نوێژی کردو هەردوو دەستی بەرزکردەوەو بەدەنگی بەرز، وتی: خوایە ئەوەش کوڕەکەی ترم کە بە ئەمانەت بەمنت سپاردبوو، ئەوا بە شۆراوی و پاك و خاوێنی تەسلیمم کردیەوە، خوایە شوکرم بە قەدەرو بڕیاری تۆ، ئیتر ناوچەوانی کوڕەکەی ماچ کردو خواحافیزی لێکرد.

خەڵکی بەو هەڵوێستە زۆر سەرسام بوون و دەگریان، باوەڕ بکەن دادە ئامێنە دڵخۆشی خەڵکی ئەدایەوە، دەیوت: ڕۆڵەگیان دونیا تەواو دەبێ، هەموو دەمرین ئومێدم وایە لە بەهەشتدا پێیان شاد بینەوە.

ئێمەش ئومێدمان وایە ئەم ئافرەتە پاڵەوانە خۆڕاگرە دوو کۆشکی ناوازەو نازدارو ڕازاوەی بەهەشتی پێببەخشرێ لەلایەن خواوە، بەپێی بەڵێن ووادەی پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرموویەتی: هەرکەس منداڵێکی بمرێت و خۆڕاگر بێت خوا کۆشکێکی پێ ئەبەخشێ لەبەهەشت بەناوی کۆشکی سوپاسگوزاری ..

خۆشە ئەوە بزانین هەر لە دونیادا ئەنجامی خۆڕاگری و شوکرانەبژێری دادە ئامینە چی بوو؟ دوای ئەم هەڵوێستە جوامێرانەی دادە ئامینە بە یەك سك دوو کوڕی بوو، ئەم دوانەیەی ناونا عەلی و خدر، دواتر عەلی و خدر یەکی پێنج کوڕیان بوو، کە ئێستا کوڕەکانیان زیندوون، ئامینە خان هەر لە دونیادا دڵ و چاوی ڕۆشن و فێنك بووەوە بە بینینی عەلی و خدرو دە کوڕەزاکەی.

منی نوسەری ئەم کتێبەش حەزمکرد ئەم دیمەنە جوان و قەشەنگە لە خۆڕاگری ئەو ئافرەتە ئیمانداره بنوسمەوە، بۆ ئەوەی خەڵکی سودی لێوەرگرن و لە مێژووی ئەم میلەتەشماندا بە زیندووی بمێنێتەوە.

# پێنج کوڕی بە ڕۆژێك کوژران

لەساڵی ١٩٩١ بەهۆی ئاوارەییەوە چوینە شاری بانە، لەپاش چەند مانگێك بەماڵەوە چومە گوندی شوێ لە مزگەوتی شوێ سەرقاڵی دەرس خوێندن و شتی تر بوم، برایەکی بەڕێز هاتبوو بۆ سەردانم، دوای هەواڵپرسین و بەخێرهاتن دیار بوو کارێکی هەبوو، ڕوی تێکردم و وتی: من کارێکم کەوتۆتە ئێرە (ئێران) بۆم جێبەجێ ناکرێت، ئەڵێن: ئەگەر تۆ بتەوێ لەوانەیە بەهۆی خزم و ناسیاوەکانتەوە ڕێگە چارەیەکی باش بزانیت، وتم: کارەکەت چی یە؟ وتی هەندێ پارەم قەرزکردوەو کەلوپەلم پێکڕیوەو هێناومە بۆ ئێران، ئێستا هەمووی گیراوە بەڵکو فریام کەوی، چونکە پارەکە پارەی خەڵکەو عەیبدار دەبم، منیش پرسم بە برایەکی بەڕێز کرد بەناوی مامۆستا (عبدالله سید عبید)، وتی: خەمت نەبێ بە خزمان مەڵێ و تەکلیف لەکەس مەکە، هەر ئەمڕۆ وەرە دەچین بۆ لای (مجیدخانی کوڕی حەمەرشیدخانی بانە)، منیش وتم: من نایناسم، وتی: من دەیناسم، هەر کەبزانێ ئێمە لە ڕشتەی فەقێ و مەلایاندایین هەرچی بۆ بکرێ بۆمان دەکات.

بەڵێ ڕۆیشتین، بە پرسیار ماڵی مجیدخانمان دۆزیەوە، لە دەرگاماندا، زۆر بەگەرمی پیشوازی لێکردین و زۆر شاهانە ڕێزی لێگرتین بەجۆرێك بە خەیاڵماندا نەدەهات، دواتر وتمان: ئیشەکەمان بەبەڕێزت ئەوەیە دۆستێکی زۆر خۆشەویستمان شتی گیراوەو قەرزداریشە وەهەموو شتەکانی بەقەرز کڕیوە، ئێستا لەسەر سنور لەلایەن ئێرانەوە شتەکانی گیراون،

ئێمەش هاتینە خزمەتت بەڵکو ئەگەر شتێکت لەتوانادایە بۆ ئەو براخۆشەویستەمانی بکەیت، وتی: ئێوە دانیشن و خەمتان نەبێت وابزانن شتەکان لەبەر دەستاندایە، هەر ئێستا نامەیەکتان بۆ دەنووسم، بەهەر حاڵ قسەی خۆشمان زۆر کرد، ئەویش پرسیاری زۆری کرد، پیاوێکی شارەزاو دونیا دیدە بوو، ئێمەش وەڵامماندایەوەو هەڵماننا بۆ چاکەکردن و یارمەتیدانی خەڵکی، لە کۆتاییدا چەند دێرێکی جوانی نوسی و خستیە زەرفێکی نامەوەو دایە دەستم.

ئینجا دڵمخۆش بوو کە شتێکم بۆ دۆستەکەم کردووە، سەرێکم بەرزکردەوەو چاوم بە کتێبخانەو ناوماڵەکەدا گێڕا، لە سوچێکی ژوورەکەدا تابلۆیەکی گەورەم بینی، دیمەنێکی سەرنجڕاکێش بوو، ! وێنەی سەرو ڕوخساری شەش کوڕی گەنجی تیابوو، لە گەردنیانەوە بەرەو سەرەوەی تیابوو، زۆر سەرنجی ڕاکێشام، دەبێ ئەم پیاوەناودارە بۆ وێنەی ئەم هەموو کوڕە گەنجەی لە دیوەخانەکەیدا هەڵواسی بێت!؟ دوای تێڕامانێکی زۆرو چەندان جار ئاوڕدانەوە بۆ تابلۆکە، وتم: دەمەوێ پرسیارێك بکەم، وتی: فەرموو، زۆرم پێخۆشە پرسیارم لێبکەن و پرسیارتان لێبکەم، وتم: ئەم شەش کوڕە جوانخاس و جەوانانە چی جەنابتن؟ هەناسەیەکی قوڵ و خەفەت ئامێزی هەڵکێشاو وتی: هەر شەشیان کوڕی خۆمن، وتم: لە ژیاندان؟ وتی: نەخێر، وتم: بەچی مردوون؟ دەستی بۆ کەسێکیان درێژکرد. کە لەسەروی هەموویانەوەبوو، وتی: ئەمەیان لە کوردستانی عێراق کوژرا، ئەم پێنجەشیان لەماوەی پێنج خولەکدا کوژران، کاتێك فڕۆکە جەنگیەکانی عێراق لەسەردەمی جەنگی

عێراق و ئێرانداو لەگەرمەی ئاهەنگێکی گەورەدا کە دەوڵەت رێکی خستبوو زیاتر لە ١٥٠٠ هەزارو پێنج سەد کەس تیایدا کوژرا، بەڵێ لەماوەی کەمتر لە پێنج خولەك تەرمی ئەو پێنج کوڕەم بۆ هاتەوە بەردەرگا، بەڵام هەر سوپاسی خوام کردو وتم خوایە تۆ ئەو کوڕانەت بە من داوە تۆش لێت وەرگرتمەوە. ئەم پیاوە وانەیەکی گەورەی لە ئارامگری وخێرخوازی وموسوڵمانێتی فێری ئێمە کرد.

## دەبێ بە پێیەکانی خۆت بەرەو ئەجەل بڕۆی

ساڵی (١٩٧٢) لەپیری شەوکێڵ بوم[١]، پیاوێکی لای خۆمان ناوی عمری حەمەمامالی بوو، هات و سەلامی لێکردم، وتی: ئیشم پێتە، منیش ئامادەییم دەربڕی، وتم: ئێمە هاومالّ و دۆست و ناسیاوی یەکین، هەرچی بە من بکرێ بەسەرچاو، کاتیش دوای عەسرو دەمەو ئێوارە بوو، وتی: هەندێ سەعاتم فرۆشتوەو بەیانیش جەژنە ماوەیەك بازاڕو دوکان نابێت، لەگەڵم وەرە بۆ سلێمانی پارەی سەعاتەکان وەردەگرم و یەکسەر دەگەڕێینەوەو هیچ ماتڵت ناکەم، منیش زۆر ئینکاریم لێکرد، وتم: تازە کات درەنگەو هەرکاتێکی تر دەڵێی ئەوە بەسەرچاو، بەڵام تازە ڕۆژ درەنگەو فریاناکەوین و منیش ماندووم، هەرچۆنێك بێت قەناعەتم پێکرد، وازی هێنا، دوای تاوێك هاتەوە دەستیکردەوە بەتەکلیف و گلەییکردن

---

[١] (شێخ موحەممەد شێخ عبدالرحمن) وازەیی.

لەجاری پێشوو توندتر، ئەمجارەش بەهەر دەردی سەرییەك بێت بەنیوە ئاشتی و نیوە شەڕ قەناعەتم پێکردو ڕۆشت ولێی بێخەم بووم، بەخوا هەر ئەوەندەی چایەك بخۆیتەوە، کاك عمر هاتەوە ئەم جارە شەڕی لێدەباری، هاتەوە دەستی کرد بە گلەیی و وردە جنێو، ئەو کاتەش وەکو ئێستا سەیارە زۆر نەبوو، ناچاری کردم هەستام و وتم: بابڕۆین! ئیتر نەمن و نە کاك عمر نازانین لە خەزێنەی پڕ نهێنی خوا چیمان بۆ بڕیار دراوە.

بەڵام کاك عمر زۆر کەیفخۆش و بەجۆش و خرۆش بوو، منیش بە بێگاری بەڵێم بۆدەکرد، لەڕێگە زۆر پەلەم دەکرد، چونکە دەمەو ئێوارە بوو، تا خێراتر بڕۆیشتمایە کاك عمر بە کەیفتر دەبوو، گەیشتینە سەری ئەزمڕو سلێمانیمان لێدەرکەوت. سەیارەش بەدیوی سلێمانیدا بە خێرایی جادەی دەبڕی، تا لە پردی عەلیاغا پەڕینەوە، ئەوشوێنە زۆر بەرزو ترسناك بوو، وەکو ئێستاش خۆش نەکرابوو، هەر کە لە لۆفەکە گەڕامەوە سەیارەکە لە دەستی وەرگرتم وبەو شاخ وداخ وتەلان وهەڵدێرەدا ڕۆیشتە خوارەوە، منیش هەر وەك کاك عمر هیچ دەسەڵاتم نەما بەسەر سەیارەکەدا، تا لە دامێنی لێژاییەکە وەستا، کە دابەزیم هیچ عەلەمم نەبوو، ڕامکرد بۆ لای کاك عمر، تەماشام کرد کاك عمر مردبوو. ئینجا وتم: دەك خوا عەفوت بکات، بە خوا ئەم پەلە پەلەت هی ئەجەلەکەت بوو، من نەمدەزانی.[1]

---

[1]–لە زمانی (شێخ محمد حاجی شێخ مصطفی) کورەداریەوە وەرگیراوە.

# ئەوەی لای بەندە خەیاڵەلای خوابەتاڵە

لەساڵی (٢٠٠١) بۆ (٢٠٠٢) چومە ئێران[١]، دواتر بۆ کارێکی سەفارەت لەگەڵ خێزانێك چومە تاران، دوای تەواوبوونی کارەکەم ویستم بگەڕێمەوە بەرەو کوردستان، هاتمە گەراج سەیارەیەکی تەکسیم دەستکەوت و جێگەم گرت، لەو کاتەدا کە چاوەڕێی نەفەری ترمان دەکرد، من کەمێك لەسەیارەکە دوورکەوتمەوە ویستم پشوێك بدەم، چونکە خەمی جێگەگرتنم نەمابوو، سەیارەم مسۆگەر کردبوو، زۆریش دوورنەکەوتمەوە، نەوەك نەفەر بێت و چاوەڕێم بکەن، بۆیە خێرا گەڕامەوە لای سەیارەکە، تەماشام کرد نەفەرێك لەجێگەکەی من دانیشتبوو. وتم: ئەوە جێگەی منە، بەڵام نەفەرەکە کردی بە ئینکاری و ملەجیڕێ و دانەبەزی، زۆرم لەگەڵ وتو کەمی بیست، بە هەر حاڵ وازم لێهێنا، بەڵام زۆرم پێناخۆش بوو، چونکە حەزمدەکرد خولەکێك زووتر بەڕێبکەوم، ئەو ئوتومبێلە بەڕێکەوت و دوای کەمێك منیش چومە سەیارەیەکی ترەوە، زۆری پێنەچوو پڕبوو بە ڕێکەوتین و ئەوەندەشمان بەین نەبوو لە گەڵ سەیارەکەی پێشوودا.

کە گەیشتینە نێوان شاری سنەو مەریوان، وردتر بڵێم نزیك گوندی "نگڵ"، بینیمان قەرەباڵغیەو خەڵکی لەسەرەوە سەیری خوارەوە دەکەن، شۆفێرەکەی ئێمەش هەواڵی پرسی و سەرێکی ڕاوەشاند، وتی: ئەزانن کێیە؟ ئەو شۆفێرە بوو کەلەپێش مندا دەرچوو، ئیتر من زانیم ئەو تەکسیە بوو کەنەفەرەکە بە زۆر جێگەکەی لەمن داگیر کردو خەفەتم زۆر

---

[١] لە زمانی (کاك موحسین ئەمینیەوە) بیستومە .

لێخوارد، نەمزانی بۆم دەبێتە خێرو خوای گەورە لە قەرەبوی داگیرکردنی جێگەکەم و خەفەت خواردنم سەلامەتم دەکات، وکێشەو ناڕەحەتی و بەلایەکی گەورەترم لێ لائەدات، وەکو دەڵێن ئاش لەخەیاڵێك و ئاشەوان لەخەیاڵێك، بەڕاستی چاکیان فەرمووە: "التقدیر یلعب بالتدبیر"، بڕیاری خوا یاری بە تەکبیرو ڕای خەڵکی دەکات.

کاك محسین وتی: لێرەدا بەسەرهاتی "محمود إسماعیل"م[٢] بیرهاتەوە، کاتێك ویستبوی لە شاری سنەوە بۆ سەردانی ماڵی شێخ باهیری خزمیان بەرەو شاری کرماشان بڕوات، کە دەچێتە گەراج و جێگە دەگرێت مشتومڕ لەنێوان نەفەرەکاندا دروست دەبێت و دەبێتە دەمەقاڵە، کەس لە نەفەرەکان ڕازی نابێ بچێتە پێشەوە، شێخ محمود إسماعیلیش جێگەی خۆی گرتووە، بەڵام بۆ چارەسەری کێشەکەو بۆ ئەوەی سەیارەکەش زوو بەڕێبکەوێت، دەڵێ: من دەچمە پێشەوە، بەڵێ لەپێشی سەیارەدا سوار دەبێت، سەیارە بەڕێدەکەوێ، لەڕێگە سەیارەکە توشی ڕوداوی هاتوچۆ دەبێت، تەنها شێخ إسماعیل لەوێدا گیان لەدەست دەدات خوا لێی خۆش بێت.

---

٢- برای شیری مامۆستا "عبدالله داود"ە ناسراوە بە "مەلا عبدالله جیهاد".

# میوانی خوام ناچمە ماڵی کەس

ئەو کەسەی ڕوو لەماڵی خوا دەکات میوانی خوایە، میوانیش ڕێزی تایبەتی هەیە، لەئیسلامدا خزمەتکردن و ڕێزگرتنی میوان خواپەرستیەو ئیمانداریە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: **"من كان يؤمنُ بالله واليوم الآخر فليُكرِم ضيفَهُ"** هەر کەس بڕوای بە خواو ڕۆژی دوایی هەیە با ڕێز لە میوانەکەی بگرێت، بەڵکو میوان پەروەری و میوانداری ڕاستەوخۆ مامەڵەکردنە لەگەڵ خوادا، ئەم میوانویستییە سیفەت و ڕەوشتی تەواوی پێغەمبەران و پیاوچاکان بووە. خزمەتکردنی میوان جێبەجێ کردنی فەرمانی خواو پێغەمبەرە(ﷺ)، شاعیریش بە تەوبەکاران دەڵێ: بۆ گیرابونی تەوبەو سڕینەوەی گوناەو تاوانەکانتان ڕوبکەنە ماڵی خوا، ئیتر گیرابونی تەوبەو بە ئاوات گەیشتنت مسۆگەرە، بۆیە دەڵێ:

**أصبحتُ ضيفَ الله في دار الرضا — وعلى الكريم كرامة الضيفان**

**تعفوا الملوك عن النزيل بساحهم — فكيف النزول بساحة الرحمن**

**يا من إذا وقف المسئ ببابه — ستر القبيح وجاد بالإحسان**

**أنا المسئ دعوتك سيدي — تعف وتصفح لعبيد الجاني**

واتە: بومە میوانی خوا لە خانەی ڕەزامەندی، ڕێزداریش پێویستە ڕێزی لە میوان بگرێت.

پاشاکان هەرکەس بچێتە ماڵیان و ڕوویان تێبکات چاوپۆشی لێدەکەن و لێی خۆشدەبن، ئەی ڕووکردنە ماڵ و مەنزڵی خوا دەبێ چۆن بێت؟

ئەی ئەو خودایەی هەر گوناهبارو تاوانبارێك ڕوو لە دەرگاکەی بکات، خراپەکانی بۆ دەپۆشێ، وچاکەشی لەگەڵ دەکات. دەی منیش یەکێکم

لەخراپەکاران، پەروەردگارا! داوات لێدەکەم و لێت دەپاڕێمەوە، لەم بەندە بچوکە گوناهبارەی خۆت خۆشبە.

مامۆستا (جەلال کوڕی مامۆستا مەلا أحمدی ئەڵڵایی) بۆی گێڕامەوە لە زمانی باوکیەوە خوا لێی خۆش بێت. باوکم بۆی گێڕاینەوە، فەرمووی: ساڵێك چوومە ئێران، لە شاری بانە بووم، بۆ نوێژی ئێوارە چومە مزگەوتی گەورەی بانە، ئەو کات و سەردەمە وابو دوای نوێژ، بە تایبەتی دوای نوێژی ئێوارە، هەرکەس غەریب و بێخانەخۆێ بوایە، پیاوانی گەڕەك خوڵکیان دەکردو بە زۆر دەیانبردە ماڵی خۆیان، نەیاندەهێشت کەس بێنەواو بێ جێگەو خواردن بمێنێتەوە. بەڵێ هەموو خانەخوێیان هەبوو، تەنها پیاوێك لەناو مزگەوت مابوەوە، دیاربوو خانەخوێی نەبوو، پیاوان لەهەموو لایەکەوە ڕویانتێکردو فەرموو فەموویان لێکرد، بەڵام کابرا دوعای خێری بۆ کردن و زۆر مەمنونیان بوو، پێی وتن: بە خوا نیازم نیە بچمە ماڵی کەس، ئەم شەو ئائێرە جێگەمەو میوانی خوام و ماڵی خوا بەجێ ناهێڵم، دوای تکاو ڕجایەکی زۆر بەگوێی نەکردن و خەڵکەکەش بەجێێیانهێشت و هەر کەس بەرەو ماڵی خۆی.

بەیانی کەهاتین بۆ مزگەوت بۆ جەماعەتی نوێژی بەیانی، دەبینین کابرای میوانی خوا مردوە.!

ئیتر بە دەستە جەمعی پیاوانی مزگەوت لەگەڵ مامۆستادا تەرمەکەمان شۆردو کفنمان کردو نوێژمان لەسەر کردو بردمانە سەر گۆڕستان بۆ ئەسپەردەکردن و بەخاکسپاردنی، بەڵام مامۆستای مزگەوتەکە فەرمووی: پەلە مەکەن! بەخوا دەبێ بەدەستی خۆم لەناو گۆڕیچەکەدا ڕایکێشم،

هەرچەند خەڵکەکە زۆر هەوڵیاندا ئەو ئەزیەتە نەدەنە بەر مامۆستا، بەڵام ڕازی نەبوو، فەرمووی: ئەم پیاوە میوانی خوا بوو، بە میوانی کەسمان ڕازی نەبوو، بە خوا دەبێ ئەم میوانەی خوا زۆر جوان و چاك و پاك و خاوێن بەدەستی خۆم تەسلیمی خوا بکەمەوە، ئیتر مامۆستا چوە ناوگۆڕەکەو پیاوەکان تەرمەکەیان بۆ داهێشتە ناو گۆڕەکە، مامۆستاش[1] وەکو براو کەسی خۆی باوەشی بە تەرمەکەدا کردو لەناو گوڕیچەی ناو گۆڕەکەدا لەسەر لای ڕاست و بەجوانی ڕایکێشاو بە خوای سپارد.

## دوای نزیکەی شەست و پێنج ساڵ بەیەك شاد بوونەوە

حاجی سلێمانی[2] ئاسنگەر لە گوندی کوڕەداوێی شاربازێڕ کە لەبنەڕەتدا خەڵکی شاری مهاباد (ساباڵخی) کوردستانی خۆرهەڵاتە، بە منداڵی یان دەستە هەرزەکاری هاتۆتە مامەخەلان دواتر ژنی هێناوەو هاتۆتە کوڕەداوێ ودەستی کردووە بەکاری ئاسنگەری، دواتر بەهۆی ژن و ژنخوازیەوە بووە بە یەکێك لە هاوڵاتی و دانیشتوانی ڕەسەنی کوڕەداوێ، ئیتر لەبەر هەرهۆیەك بووە نەگەڕاوەتەوە بۆ مهاباد وناو کەسوکاری، پیاوێکی زۆر دەست ڕەنگین وکارامەو پوختەکار بووە.

لە کۆتایی تەمەنیدا ئەچێت بۆ حەجی ماڵی خوا، لە دوای تەواوکردنی حەج وگەڕانەوەی حاجیانی عێراق لەبەغداد چەند شەوێك لە میوانخانە

---

[1] ـ ئەم مامۆستایە پێشنوێژو وتارخوێنی مزگەوتی گەورەی شاری بانە بوو، بەداخەوە باسی ڕۆژو ساڵەکەی نەکردووە.

[2] ـ (حاجی سلێمان) باپیرە گەورەی دایکمە .

دەمێننەوە، کە ئەوکات پێیان وتووە (خان)، دوای پشودانێکی سێ ڕۆژی کاروانی حاجیانی کوردستان خۆیان دەپێچنەوە بۆ بەڕێکەوتن بەرەو ناوچەکانی خۆیان، هاوڕێکانی حاجی سلێمانیش بەرەو سلێمانی بەڕێدەکەون، بەڵام حاجی سلێمان لەبەر نەخۆشی هەر لە میوانخانەکە دەمێنێتەوەو حاجیەکانی هاوڕێی ئیزن ئەدات و دەڵێ: ئێوە بڕۆن و لە کاروان دوامەکەون، منیش بەیانی ودووبەیانی چاکبووم دێمەوە.

دوای چۆڵکردنی میوانخانەکە کاروانی حاجیانی کوردستانی ڕۆژهەڵات (ئێران) لە هەمان میوانخانە دادەبەزن وبەسەر ژوورەکاندا دابەش دەبن، بە ویستی خوا هەرچی حاجیەك کە سەر بە ژوورەکەدا دەکات کە حاجی سلێمانی لێیە ڕازی نابێ بچێتە ئەو ژوورەوە، چونکە ئەو نەخۆشەی تێدایە ودەترسن لە ئیسراحەتی بکەن یان نەخۆشەکە ئەوان لە خەوو ئیسراحەت بکات، هەتا سێ حاجی مهابادی دێن بێ یەك و دوو خۆیان دەکەن بەو ژوورەدا کە حاجی سلێمانی لێکەوتووە، بەبێ دودڵی شتومەکەکانی خۆیان دادەنێن و سەلام و ئەحواڵپرسی حاجی سلێمان دەکەن و پاڵی لێدەدەنەوە.

دوای پشودان و حەسانەوەو نانخواردنی ئێوارە، دەست دەکەن بە قسەی خۆش و باس و خواسی حەج، لەناو قسەکاندا حاجی سلێمان لێیان دەپرسێ: جەنابتان خەڵکی کام ناوچەی کوردستانی ئێرانن؟ دەڵێن: قوربان خەڵکی شاری مهاباد، بەڵێ، ئێ لەکام گەڕەکن؟ لەکام هۆزو عەشیرەتن؟ دەڵێن: عەشیرەتی ئاسنگەرەکانی مهابادین!!

حاجی سلێمان زۆر بە سەرسوڕمانەوە تێیان ڕادەمێنێ ودەڵێ: ناوتان چیە؟ کوڕی کێن؟ ناوی خۆیانی پێ دەڵێن: حاجی ابراهیم و حاجی مجید و حاجی ئیسماعیل، کە هەرسێکیان ئامۆزای خۆی بوون.

حاجی سلێمانیش دڵی پڕدەبێ لە گریان و بەدەم گریان و فرمێسك ڕشتنەوە ڕویان تێدەکات ودەڵێ: منیش سلێمانی ئامۆزاتانم، ئیتر هەرسێکیان باوەشی پێدا دەکەن و هەڵدەدەنە پرمەی گریان، دیمەنێکی زۆر پڕ غوربەت و پڕ سۆزو میهر دروست دەبێ لەنێوانیاندا.

دواتر کاروانی حاجییەکانی ئێران دوای چەند ڕۆژێك بەڕێدەکەون، ئەو سێ حاجیەش خواحافیزی لەکاروانی خۆیان دەکەن و بە حاجییەکانی هاوڕێیان دەڵێن: بە خوا ئێمە ئەم ئامۆزایەی خۆمان بە نەخۆشی بەجێناهێڵین، لەدوای بەڕێکردنی هاوڕێکانیان چل ڕۆژ لەلای حاجی سلێمانی هاوڕێیان دەمێننەوە تا چاکدەبێتەوە، ئینجا تا سلێمانی پێکەوە دەبن و لەوێ خوا حافیزی لێدەکەن وگەردنی یەکتر ئازاد دەکەن وبەدەم هەواڵ و باسەوە دەڕۆنەوە بۆ مهاباد، حاجی سلێمانیش دەگەڕێتەوە بۆ کورەداوێ، هەواڵ و دەنگ و باسەکە بۆ خزمانی کورەداوێ و کوڕو کوڕەزاکانی دەگێڕێتەوە لەگەڵ دەنگ و باسی حەجکردنەکەی، خزمەکانیشی بە بیستنی ئەم بەسەرهاتە پڕ سۆزو ویژدان بزوێنە سۆزی خزمایەتیان دەجوڵێ و فرمێسك بەچاویاندا دێتە خوار[1].

---

[1]- ئەم بەسەرهاتەم لە ڕیشسپی و سەرسپیەکانی گوندی کورەداوێی شاربازێڕ بیستوەو لە کتێبی (بیرەوەریەکانی گوندی کورەداوێی شاربازێڕ) دا نوسیومەتەوە لاپەڕە ٨٥-٨٦.

# گرانیش چۆکی پێ دانەدا

ورەبەرزی بەهرەیەکی گەورەو بێ وێنەی خوایە، ورەبەرزی سیفەت و خەسڵەتی ناوازەی پێغەمبەران و پیاو چاکانە، بەدرێژایی مێژو چیرۆکی ورەبەرزو مەردو نەبەزەکان چەکی دەستی شۆڕشگێڕان و بانگخوازان و خۆڕاگران بووە، هەر بەو ورە بەرزیەش بونەتە مەردی ناو گەل و مێژو چیرۆکی ناو کتێب و کۆڕو نوسینەکان، زاناکان کتێبی خۆیان پێ نەخشاندوەو وتاربێژەکان کردویانەتە هەوێنی وتارەکانیان ورەی خەڵکیان پێ بەرز کردوەتەوە.

مامۆستا جەلالی گەورەدێ بە ڕەحمەت بێت وتی: لەسەردەمی گرانی و نەبونیدا لەسەرەتای نەوەدەکاندا لە ساڵەکانی ١٩٩٢ – ١٩٩٣ دا ئافرەتێکی بەتەمەنی خزمی خۆمانم بینی، زۆر بەزەییم پێیدا هاتەوە، وا گومانم برد کە نەبوو هەژار بێت، منیش سەلامم لێکردو هەرچەند هیچم پێنەدەکراو هیچم لە دەست نەدەهات، بەڵام خۆم پێنەگیرا وتم: پورێ حاڵتان چۆنە لەگەڵ ئەم نەبونی وگرانیەدا چۆنن؟ پەکتان نەکەوتوە؟ ئافرەتەکە بە دەنگێکی زوڵاڵی و مەردانەو ورەبەرزانە وتی: مامۆستا گیان خوا پەکی حەرەسی نادی عارەقخۆرەکان ناخات چۆن پەکی ئێمە دەخات، بەڕاستی ئەمە مەردایەتیە، ئازایەتیە، ورەبەرزییە، پیرەژنێکی نەخوێندەواری هەژاری کوردەواری ئەوەندە بڕوای قایم و ورەی بەرز بێت لەو گرانی و تەنگانەیەدا.

بەکوردی لەخۆشی و هەرزانی و ئاسودەییدا هەموو کەس ورەی بەرزە، ئەوەش ئازایەتی نیە، بەڵام مەردایەتی و ورەبەرزی لە تەنگانەو ناخۆشی و ترس و لەرزو هەژاریدا دەردەکەوێت.

ئەڵێن: شێر ئەگەر لە برسا سکی بە پشتیەوە بنوسێ و برسیەتی تینی بۆ هێنابێت نێچیری خۆی نەبێت نایخوات و دەم بۆ نێچیری هیچ گیانلەبەرێکی تر نابات.[1]

دکتۆر (سید بن حسين العفانى) لە کتێبی (**صلاح الأمة في علوم الهمة**) بەرگی حەوت لاپەڕە ٢٠٧ دەڵێ: (**مَن كان همُّهُ ما ياكلُهُ، فقيمته ما يُخرجُهُ**) واتە: هەر کەس خولیای خواردن و چڵێسی بێت، هەر بە ئەندازەی ئەوەش بەنرخە کە لێی دەردەچێ.

مام خواکەرەم لە ناوچەی هەورامان ژیاوە تەمەنی ١٦٠ساڵ بووە،[2] لە تەمەنێکی گەورەدا چۆتە حەج، کە لە دەورەی ٩٠ ساڵیدا بوە، کاتێك چۆتە سوریا کاروان بەجێیان هێشتوە، بڕیار دەدات نەگەڕێتەوە وهەر لە سوریا دەمێنێتەوە، دەستدەکات بە پینەچیەتی هەتا ساڵی داهاتو کاتی حەج دێتە پێشەوە خۆی دەژیەنێ ودەست لەکەس پان ناکاتەوە، پارەی حەجەکەشی هەرپێ دەمێنێت، ئەم ساڵی تازە لەگەڵ کاروانی حاجیان بەڕێدەکەوێت و حەجی ماڵی خوا دەکات، خوای گەورە ڕێزێکی زۆری لێدەگرێ، کە هەرگیز خۆشی گومانی بۆ شتی وا نەچووە.

---

[1]- صلاح الأمة چاپی دووەم (ج٧/ص٢٠٣)

[2]- لەزاری مامۆستا شێخ صديق سەرگەتییەوە (خوا لێی خۆش بێت)، وەرمگرتووە.

هەر لەزاری خۆیەوە گێڕدراوەتەوە کە وتویەتی: کاتێك دەرگای حەرەمی کەعبەی پیرۆزیان کردەوە بۆ پاشای سعودیە من لە بن دەرگاکەدا بە ڕیشی سپیەوە دەپاڕامەوە، کابرای پاسەوانی تایبەتی پاشا پەلی گرتم، وتی: تۆش بچۆرە ژوورەوە، منیش خێرا چوومە ژوورەوە، ناو ماڵی کەعبەی پیرۆزم لەگەڵ پاشای ئەو کاتەی سعودیەدا ماڵی وپاکم کردەوە، ئیتر هەرچی ماندویەتی و دووری ماڵ و منداڵ هەیە لەخۆشیا لەبیرم نەما، هەستم بە خۆشی و ئاسودەیی و ڕۆحسوکیەك کرد هەرگیزاو هەرگیز لە دڵ و گیانم دەرناچێت، لە کۆتایی تەمەنیشیدا ئەم داستانە خۆشەی دەگێڕایەوە، کە بەڕاستی دیمەنێکی سەرنجڕاکێشە بۆ پیرێکی ورەبەرزی وەك مام خواڕەحم.

## ڕۆژانەکەم ئەدەم بە چۆلەکەو بەرەڵڵای دەکەم

لە ساڵەکانی (٢٠٠٠) یان (٢٠٠١)دا بوو باش ساڵەکەم لەیاد نەماوە، ماڵم نزیکی ئەو مزگەوتە[١] بوو کە پێشنوێژیم تێدا دەکرد، نزیکی بانگی عەسر بوو لەماڵ هاتمەدەر بچم بۆ مزگەوت بۆ پێشنوێژی، لە نێوان ماڵی خۆمان و مزگەوتەکەدا سێ منداڵم بینی مشتومڕیان بوو، منیش وامزانی شەڕیانەو لە مزگەوتیش بینیبومن، ڕۆشتم بەرەو پیریان تا نەهێڵم شەڕبکەن، بەڵام کە نزیك بوومەوەو لێم پرسین شەڕنەبوو بەڵکو خێر بوو.

[١]- لە سلێمانی مزگەوتی ئەزمەڕ لەگەڕەکی مجیدبەگ. نوسەر

ڕومکردە منداڵێکیان کە بەجیا تەرەفێکی مشتومڕەکەبوو، وتم: کاکە بۆ شەڕ دەکەن؟ وتی: مامۆستا شەڕناکەین، من دایکم دینارێکی[1] داومەتێ بۆ خەرجی قوتابخانەو منیش ئەمڕۆ خەرجم نەکردووە، دەمەوێ ئەو چۆلەکەی پێبکڕم لەم کوڕەو ئەویش پێم نافرۆشێت، وتم: جا کاکە تۆ چۆلەکەت بۆچیە بۆ دینارەکەت نادەی بەبسکیتێك و بیخۆیت! وتی: نا مامۆستا ئەوە خێرترە، من لە مزگەوت گوێم لە مامۆستا بوو لە وتارەکەیدا دەیوت: پێغەمبەر (صەلات و سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرمویەتی: ژنێك سەگێکی تینوی تێرئاو کردووە خوا بەو کارەی بەخشیویەتی، منیش دەمەوێ ئەو چۆلەکەیە بکڕم وئازادی بکەم (بەرەڵڵای بکەم) تا خوا لێم خۆش بێت! (منداڵەکە تەمەنی هەشتساڵ بوو لە پۆلی دووی سەرەتایی بوو).

ئینجا ڕووم کردە منداڵەکەی تر کە هاوڕێی قوتابخانەی بوو لە هەمان پۆل بوو (تەمەنیشی هەشت ساڵ بوو)، وتم: ئەی کاکە تۆ بۆ چۆلەکەکەی پێ نافرۆشیت؟ وتی: ئەوە برا گەورەکەمە ناهێڵێت، (برا گەورەکەشی کە لە سێی سەرەتایی بوو تەمەنی نۆ ساڵ بوو)، براکەی قسەکەی لەدەم ئێمە سەندەوەو وتی: مامۆستا ڕاست دەکات من ناهێڵم پێی بفرۆشێت، وتم: بۆچی ناهێڵی؟ وتی: دەڵێم ئێمەش وەکو ئەو پێویستیمان بە خێرە با خۆمان چۆلەکەکە بەرەڵڵا بکەین، بەڵکو خوا لەخۆمان خۆش ببێت و خێرەکە بۆخۆمان بێت!

---

[1]- ئەو کاتە پارەی عێراقی ڕەواجی هەبوو دیناری ئاسن هەبوو بۆ ڕۆژانەی منداڵ .

لە كاتى ئەم نوسینەدا بەسەرهاتێكم بیردەكەوێتەوە، لە زمانى پێشەوا غەزالیەوە (ڕەحمەتى خواى لێبێت) خۆم خوێندومەتەوە بەڵام شوێنەكەیم لەیاد نەماوە، غەزالى دەفەرموێ: پیاوێك لەسەردەمى سەلەفدا لەسەر ئاوێك دەستنوێژ دەگرێت، دەبینێ منداڵێكیش خەریكى دەستنوێژە وبەدەم دەستنوێژەكەوە دەگرى، پیاوەكەش لێى دەپرسێ بۆچى دەگرى؟ منداڵەكەش پێى نالێ، كابراش زۆر بەزەیى پیایدا دێتەوەو وازى لێناهێنێ، تا منداڵەكە دەڵێ: والله لەترسى دۆزەخ دەگریم! پیاوەكەش دڵخۆشى ئەداتەوە كاكە چكۆل تۆ هەر گوناحت لەسەر نییە خەمت نەبێت تۆ بێ گوناحیت، منداڵەكەش دەڵێ خاڵە من باوكم ئاوا فێرى نەكردووم، باوكم پێمان دەڵێ منداڵینە گوناح و خراپە نەكەن، ئێمە لە دونیادا ئاگر دەكەینەوە لەپێشدا چیلكەوردەكانى پێوە دەنێین تا ئاگرەكە خۆش بێت بۆ دارەگەورەكان، جا منیش دەترسم خوا لە دوارۆژدا بە ئێمەى منداڵ ئاگر بۆ ئێوەى گەورەو گوناحبار خۆش بكات، ئیتر كابرا ڕادەچڵەكێ و وازى لێدەهێنێ، منداڵەكەش دەرسێكى باشى كابرا دادەدات[1].

[1]– منالٚ بێگوناهە وبە دڵنیاییەوە خواى گەورە نایخاتە ناو ئاگرەوە، ئەمە تەنیا وانەیەكە، باوكى منالەكەش ویستویەتى منالەكەى هەر بە پاكى بهێنێتەوە .

# خۆ بەکەم گرتن لەبەر خوای گەورە

لە فەرمودەی پێغەمبەردا (سەلامی خودای لەسەربێت) هاتووە: (هەرکەسێك لەبەر خوا خۆی بەکەم بگرێت خوا بەرزی دەکاتەوە)، ئەوەی کە وایکردووە خەڵکی حەق وڕاستی نەسەلمێنن و زۆربەی کێشەو قەیرانەکان بێ چارەسەر بمێننەوە خۆبەزلزانینە، بۆ نمونە زۆرێك خوێندکاری ئەمڕۆ وادەرناکەوێ لەبەر خوا بخوێنێ وکردەوە بە زانستەکەی بکات، زیاتر بۆ بڕوانامەو دەستخستنی ماددە دەخوێنێ، بۆیە دەبینی ئاستی زانستی نزمە وبەرەکەت لە کارەکاندا کەمبۆتەوە.

(مەلا ئەحمەدی قامیشی) لە مەلا سەعیدی گولەکیانەوە دەگێڕێتەوە: لە ساڵانی پەنجاکاندا لە گوندێك لە گوندەکانی پشدەر فەقێی حوجرەکەیان زۆر خواویست و زانستخواز بوو، شەوێك ڕوناکیەك لە حوجرەکەیان بەرز دەبێتەوە وا دەزانن ئاگری گرتووە، کاتێك مامۆستاکەیان بەپەلە دەچێت بۆ حوجرەکە دەبینێت وا فەقێکان لە سەرچنگ بە شێوەی سەگ قاچێکیان کردوە بە کلك و یەکتری ڕاو دەنێن، لەسەر ئیسقانێك کە لە ناو خواردنەکەیان بووەو بەدەم هەرکامیانەوە بوایە بۆی دەچون! کاتێك مامۆستا دەگاتە بەردەم حوجرەکەو ئەم حاڵەتە ئیمانیە پاکە دەبینێ، بۆی دەردەکەوێ ئەوە نورو ڕوناکییە لەسەریانەکەیان بەرزدەبێتەوە نەك ئاگر، ئەمیش بۆ ئەوەی لە بەرەکەتە ئیمانیە بەشدار بێت بەپەلە دەکەوێتە سەر چوار پەلان ودەڵێ ڕێگای

گوڵی پیرکەن! ئیتر کە مامۆستاکە دەبینن لە شەرمان کۆتایی بە یاریەکە دێنن و نورەکەش کۆتایی دێت!

جا هەر شتێك لەبەر خوا بێت بەرەکەت وسەرکەوتنی تایبەتی دەبێت، گەر لەبەر خوا بخوێنی زانیارییەکەی سودی دەبێ، گەر لە بەر خوا ببەخشی ماڵەکەت زیاد دەکات، گەر لە بەر خوا لێبوردە بی خوا لێت دەبورێ، گەر لەبەر خوا خۆت بەکەم وبچوك بزانی ئەوە گەورەو بەرز دەبیتەوە (**ما كان لله يَنْمُ**).

## تێگەیشتن بەلای سەرە...
## ئاینی عورفی و چاو لێکەری خەتەرە

عن انس بن مالك –رضى الله عنه: قال رسول الله (ﷺ) (**طلب العلم فريضة على كل مسلم**....)[1]، واتە: گەڕان بە شوێن زانستدا واجبی سەرشانی هەموو موسوڵمانێکە...

پیرەمێردی شاعیریش (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەڵێت:

هەمیشە ئەقڵ و عیلم لە پێشە          لە هەموو شارێ ئەزان بارکێشە

مامۆستا مەلا ئەحمەدی قامیشی بۆی گێڕامەوە: لە بەهارێکی هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو لە چوارقوڕنە کشتوکاڵمان کردبوو، مام سۆفیەکی ڕیش سپی کە بەلای حەیوانەوەبوو شوان بوو بزنەکانی

---

[1] رواه ابن ماجه رقم (٢٢٩) .

کردبووه ناو گەنمەکەوە کە قەرسیل بوو، خۆشی لە سەر بەرزاییەك دەستی کردبوو بە نوێژکردن، منیش وتم: مامە سۆفی حەیوانەکان ئەو گەنمەیان نەهێشت و گەر لە زەرەردا بلەوەڕێن شیرەکەشیان حەرام دەبێت، ئەویش وتی: ئاخر زەمانە، تۆ ئامۆژگاری من دەکەی؟! ڕۆڵە گیان بزن هارن گەر لەناو گەنمەکەدا نەبن ڕادەکەن، منیش دەمەوێ قەلایان[1] زۆر بکەم .! وادیار بوو مامە سۆفی نوێژی زۆر چون بوون!

مامە سۆفی برا گیان　　حالی ببە لە قورئان
ئەو کارەی کە تۆ ئەیکەی　　مالی خەلك پێشێل ئەکەی
هەمووی بەعەکسی دینە　　حالی نەبوی لەم ژینە
توخوا خەلکە بخوێنن　　زانیاری بەدەست بێنن

# داب و نەریتی لێ بۆتە دین

هەر مامۆستا مەلا ئەحمەدی قامیشی وتی: لە نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوودا لە چوار قورنە مەلابووم، سەردەمانێك لەو دەڤەرە شایی وڕەشبەلەك زۆر باو بوو، منیش لە وتارەکانمدا جەختم دەکردەوە لە سەر خراپی و حەرامیەکەی، کابرایەکی ڕیش سپی وتی: وەللاهی لەوەتەی ڕشبەلەك وەك جاران نیە بەرەکەتیش نەماوە! دیارە بەلایەوە دین عادەتە نەك عیبادەت .

---

[1] قەلا : لە (قضی یان قضاء)ی عەرەبییەوە وەرگیراوە، ئەوتریێ نوێژی قەلا، مەبەست پێی نوێژ گێڕانەوەیە .

هەر جەنابی مەلا ئەحمەدی قامیشی وتی: لە مزگەوتی شەفیق بەگ لە سلێمانی کە لە (٢٠٠٣) وە مەلایان بوم زۆر گرنگیم دەدا بە ڕیزەکانی نوێژکردن، ئەوان پێشتر بەو شێوەیە ڕانەهاتبوون، ڕۆژێك کە وتم: ڕەحمەتتان لێبێ پاڵ بدەن بەیەکەوەو ڕێك بوەستن، لەناو ریزەکە یەکێ لە ڕیش سپیان بە دەنگی بەرز وتی: مامۆستا چەوەندەر بەتەنکی!!

# ناشکوری گرانی پێوەیە

ئادەمیزاد بە گشتی جۆرێك لە شپرزەیی و دانەمەزراوی تیایە، زۆرێکیان کە دووچاری گرفتاری وناخۆشی دەبن زوو ورەیان دەڕوخێ و هاوارو فوغان دەکەن ودەم بە هاوارن، کاتێکیش خۆشبەخت ودەوڵەمەندو ئاسودە دەبن چاکە وپیاوەتی ناکەن ودەستیان دەنوقێنن و پیسکەو نامەردی ئەکەن.

لەم سەردەمەدا لە هەموو سەردەمەکان سپڵەیی زیاتر پەرەی سەندووە، نمەك کوێری لە زۆر کەسدا بۆتە دابونەریت وخەسڵەتی نەژادی.

مەلا کەریمی[1] قشلاخ بۆی گێڕامەوە: پیاوێکی ناسیاوی وتویەتی: لەکاتی هەرزانیدا عەرەبانەم پێ بوو ئافرەتێك بانگی کردم، کەچوم وتی: خاڵە ئەو دوو فەردە ئاردەم بۆ فڕێ بدە! وتم: خوشکێ دروست نیە خوا غەزەبت لێدەگرێ ئەم ئاردە پاك و جوانە بۆ فڕێی ئەدەی، بە خوا ئەترسم خوا حەقی ئەم سپڵەییەمان لێبکاتەوە، ئافرەتەکە وتی: کوڕە

---

[1] –پیاوێکی ناسراوی دەڤەری شارباژێڕەو خەڵکی گوندی قشلاخی نزیك قەلاچوالانە.

خاڵە تۆ دەڵێی چی؟ برۆ فرێیدە خۆ ئەمە زەمانی زوو نیە گرانی چی و شتی چی!

دەڵێ: کە زانیم هەر سورە لەسەر قسەکەی خۆی، ناچار دوو فەردە ئاردەکەم خستە ناو عارەبانەکەم و ڕۆشتم، بەڵام هەرچەند سەرم هێناو سەرم برد دڵم ڕێگەی نەدام ئەو دوو فەردە ئاردە فرێ بدەم، بە ناشکوریم دەزانی، ترسی تۆڵەی لای خواشم هەبوو، بۆیە عارەبانەکەم بەرەو ماڵی خۆمان پاڵنا، وهەردوو فەردە ئاردی بێنازم بردە ماڵی خۆمان وله پەنایەکدا داپۆشین، دوای ماوەیەکی زۆر کەم لەناکاو ئاردوو خواردەمەنی هەڵکشا وبەرەو گرانی ڕۆیشتین، وردە وردە گرانتر دەبوو، ئێمەش دوو فەردە ئاردەکەمان لا خۆشەویستر دەبوو، زوو زوو سەرم لێئەدان و دەستم لێئەدان وزیاتر دامئەپۆشین.

بەڵام ئەوەی زۆر سەرنجی ڕاکێشام ئەوەبوو، ڕۆژێکیان پیاوی ئەو ماڵەی دوو فەردە ئاردەکەم بۆ فرێدان، کە هاوسەری ئەو ژنەبوو کە ئاردەکەی بەزۆر بە من فرێدا، بانگی کردم تکاو ڕجایەکی زۆری لێکردم کە هەرچۆنێك بێت فەردەیەك ئاردی بۆ پەیدا بکەم، پەکمان کەوتوەو زۆر هەوڵمداوە دەستمان ناکەوێت، بەقەدەر دونیایەك سوپاست دەکەم وەمەنونت دەبم، دەست بە ڕووموە مەنێ منیش ناچار بەروادە بووم، بەڵێنم پێدا وچوم یەکێك لەفەردە ئاردەکانی خۆیانم بۆ هێنا، وبە هەشتا دینار پێم فرۆشت، کە ئەو هەشتا دینارە پارەیەکی زۆربوو لەو کاتەدا .

# شێت، یان عاشقی خواو دین و مزگەوت

حاجی عبدالرحمن ناسراو بە ڕەحمانە شێت[1]، لە سلێمانی نیشتەجێ بوو، وەك کوردی خۆمان دەڵێن: عاشقی دین بوو، شەوو ڕۆژ هەر لە خوا دەپاڕایەوەو تکاو ڕجای لە خوا دەکرد لێی خۆشبێت، بەردەوام ناوی خواو یادی خوا لەسەر زمانی بوو، زۆر عاشقی مزگەوت بوو، مامۆستایانی ئاینی زۆر خۆشدەویست، نەخوێندەوار بوو، بەڵام بەسەعات وزیاتریش قورئانی دەکردەوە وچاوی تێدەبڕی وماچی دەکرد وبەرزی دەکردەوەو دەیکردە تکاکار تا خوا لێی خۆشبێت، زۆر داوای لە خوا دەکرد لە گوناحی دایك وباوکی خۆشبێت.

دەستوەشێن و جوێنفرۆش و دەمپیس نەبوو، زۆر لە پرسیارو وەڵامی ناوگۆڕ دەترساو هەمیشە دەپاڕایەوەو بەشێکی پاڕانەوەکەشی تەرخان دەکرد بۆ پەناگرتن بە خوا لە سزای ناوگۆڕ، دەیوت: خوایە عەزابی قەبرم لەسەر لابەری، خوایە زمانم پاراوکەی بۆ وەڵامدانەوەی نەکیر ومونکیر، لەگەڵ قسەکانیدا موچوڕکی پێدا ئەهات، وەك ئەوە وابوو تەزوی ترس و سامناکی لەبەری پێی هەڵبێت و لەتەوقی سەری دەربچێت، قسەو هەڵوێستی دۆستانەی زۆربوو لەگەڵ پەروەردگاریدا، بۆ نمونە لێرەدا چەند دانە گەوهەرێك لەو هەڵوێستانە باس دەکەم:

لە ساڵەکانی ١٩٩٧ برایەکی بەڕێز لە خزمانی گوندی کوڕەداوێی شاربازێڕ لە سلێمانی لە مزگەوتی حاجی رشیدی خەفاف فەقێ دەبێت

---

[1]- ئامۆزای باوکم بوو. نوسەر

بەناوی فەقێ ئیبراهیم[1]، وەکو خۆی بۆی گێڕامەوە، وتی: زۆر ڕۆژ ئەوڕەحمان (ڕحمانە شێت) دەهاتە مزگەوت، ودوای نوێژ دەبوایە بەزۆر بیکەیە دەرەوە ئەگەرنا بەشەویش لە مزگەوت دەمایەوەو نەدەهاتە دەرەوە، ڕۆژێکیان دوای نوێژی نیوەڕۆ لە مزگەوت مایەوە، منیش لەناو مزگەوتەکەدا خەریکی سەعیکردن بووم، لەپڕ بانگی کردم وتی: فەقێ ئیبراهیم خۆ ئێمە هەر پرسیاری ناو قەبرمان لێ دەکرێ، (جا وەکو نەریتی خۆی کە بەردەوام خۆی بۆ ئامادە دەکرد)، وتی: وەرە مەردبەو مەردی چاك بە من خۆم دەکەمە مردوو تۆش تەلقینم بکە بابزانم دەتوانم وەڵام بدەمەوە.

وتی: حاجی ئەوڕەحمان ڕاکشا ومنیش وتم: بەمەرجێ نەجولێیتەوەو قسە نەکەی! چونکە تۆ مردووی، وتی: بەڵێ باش، فەقێ ئیبراهیم وتی: ئیتر منیش دەستم کرد بە تەلقینکردنی، وتم: (ئەی ڕەحمانی کوڕی فاتیمە تۆ ئێستا مردوی و لە دونیا دەرچوی ولەناو ماڵی قەبردای، ئێستا دوو فریشتە دێنەلات و پرسیارت لێدەکەن، لێیان مەترسە ئەوان مەئمورن وزیانت پێ ناگەیەنن)، دەڵێ: لەگەرمەی تەلقینەکەی مندا ڕادەچڵەکی وگرژ دەبوو، تەزوی ترس و بیم بەلاشەیدا دەهات وبەبێ ئەوەی چاو بکاتەوە، دەیوت: بەخوا مەلابرایم عەزابی قەبر ناخۆشە، توخوا خێراکە! دەڵێ: بەو شێوەیە تەلقینم کرد لەسەر داوای خۆی هەتا پرۆڤە بکات و ئامادەباشی تیا بێت بۆ وەڵامی ناو گۆڕ.

---

[1]- مامۆستایەکی بەڕێزەو لە ژیاندایە، وئێستا لە سلێمانی پێشنوێژی مزگەوتی (بن تەبەقی هەرمنی)یە.

هەروەها کاکە قادر حسین کوردی[1] بۆی گێڕامەوە، وتی: ڕۆژێکیان حاجی ئەوڕەحمانم بینی بەرەو مزگەوت دەچوو، لە شەقامی لای مزگەوتی حاجی رشید خەفاف دەیویست بپەڕێتەوە، ئێمەش هەر وەکو لە منالّیەوە فێرکرابوین وخزمیش بوو، بۆیە ڕامکرد دەستیم گرت تا لەمبەرەوە بیپەڕێنمەوە بۆ ئەوبەری مزگەوتەکە، کاتێك گەیشتە ناوەڕاستی جادەکە پیاوێکمان توشبوو، بە شۆخی بە حاجی ئەوڕەحمانی وت: حاجی ئەوە بۆ کوێ دەچی؟ وتی بۆ مزگەوت؟ کابراش وتی: جا خوا چی پێویستیەکی بە تۆیە؟ یەکسەر حاجی عبدالرحمن هەڵوێستەیەکی کرد وقسەکەی لەدەم سەندەوە، وتی: ئاخر من پێویستیم بەو هەیە!

چەند ساڵ بوو هەر داوای دەکرد بچێت بۆ حەج و بینێرن بۆ حەج، زۆر دەچوو بۆ مزگەوتی گەورەی سلێمانی و تکاو ڕجای لە مامۆستا شێخ محمد قەرەداغی دەکرد (خوا لێی خۆش بێت) کە بینێرێت بۆ حەج، بەڵام هەر نەگونجا، تا لە کۆتاییدا خوا بەنسیبی کرد لەگەڵ برایەکیدا ڕۆیشت بۆ حەج، دوای گەڕانەوە لە حەج، حاجی طیب ی برای وتی: بە خزمەتی مامۆستا شێخ محمد گەیشتم و بەخێرهاتنەوەم کرد وهەواڵ وخەبەرم لێپرسی، وتی: حاجی طیب قسەیەکم لە ئەوڕەحمانی برات بیست زۆر مایەی سەرسوڕمانم بوو، لە کاتێکدا لەعەرەفات سەرگەرمی نزاو پاڕانەوەو خواپەرستی بووم، لەپڕ گوێم لە دەنگی ئەوڕەحمان بوو، زۆرم پێسەیربوو چونکە نەمزانی بوو کە هاتووە بۆ حەج، کە ئاوڕم دایەوە ئەوڕەحمان لە

[1]– کاك قادریش لەکەسوکارو خزمانی گوندی کوڕەداوێی شارباژێڕەو لە سلێمانی دادەنیشێت.

تەنیشتمەوە دەپاڕایەوە ودەلالایەوە، مەگەر هەر خوا بزانێت، منیش سەلامم لێکرد و وتم: حاجی ئەوڕەحمان ئەوە کێ تۆی هێناوە بۆ ئێرە؟ یەکسەر وتی: (باوکە خەتیب) ئەو خوایەی تۆی هێنا بۆ ئێرە هەر ئەو خوایە منیشی هێنا!

هەڵوێستی تری مەردانەو پیاوخوایانەی حاجی ئەوڕەحمان زۆر زۆرە، پیاوێکی خزممان کە هێشتا لە ژیاندایە بەناوی شێخ محمد[1] بۆی گێڕامەوە، وتی: جارێکیان ڕێمکەوتە مزگەوتی شێخ سەلام لە سلێمانی، ئەوڕەحمان لەوێ بوو پیاوێك دینارێکی دایە، حاجی ئەوڕەحمانیش خێراو بەهەڵەداوان هەستا وپیاوێکی هەژار لە لایەکی حەوشەی مزگەوتەکە سواڵی دەکرد (پیاوێکی داماوی نابینا)، دینارەکەی برد دایە دەستی ئەو پیاوە سواڵکەرە، ئەو پیاوەش کە دینارەکەی دابویە، وتی: ئەرێ ئەوڕەحمان من دینارەکەمدا بە خۆت و تۆم بەهەژارو موستەحەق زانی، کەچی تۆ دینارەکەتدا بەو پیاوە، حاجی ئەوڕەحمان یەکسەر وتی: ئاخر خاڵە من چاوم هەیە ئەو چاویشی نیە، بۆیە ئەو لە من هەژارترە!

کۆتایی ژیانی بە کارەساتی هاتووچۆبوو، ئەو کەسەش کەبەسەیارە لێی دابوو هەولێری بوو، لەناو کەسوکاری شۆفێرەکەدا پیاوێکی بالابەرزی بەشانوشەوکەت هەبوو، جارجارە هەر لەنێوان یەك سەعات یان زیاتردا دەستی دەکردە پێکەنین، تا شل دەبوو ئاو بەچاوەکانیدا دەهاتەخوارو هەناسەی سوار دەبوو ئینجا هێواش دەبووەوە، پێش ئەوەی ئێمە لێی بپرسین خۆی وتی: داوای لێبوردن دەکەم بەخوا بەدەست خۆم نیە، ئێمە

---

[1]- (شێخ محمد کوڕی حاجی شێخ مصطفى)ی کوڕەداوێی شارباژێڕە.

دوو براین براکەی تریشم وەك خۆم بەهەیکەلە، هەردووکمان (جەڵتەی نۆبە) لێی داوین، من بە پێکەنین و براکەم بە گریانەوە لێی داوین، بەدەست خۆشمان نیەو زۆریش تەریق دەبینەوە بەلام چارمان نیە.

## ژن و مێردی بەختەوەر

هەرکات بچومایە بۆ گوندی (کوڕەداوێ)ی شارباژێڕ دەبوایە سەردانی پیری خواناس و دونیادیە (حاجی تۆفیق دەروێش ئەمینم) بکردایە، چونکە خاڵۆزاو خۆشەویستی باوکی ڕەحمەتیم بوو، سەرەڕای خزمایەتیش زۆر دڵسۆز بوو بۆم، وپەیوەندییەکی پیتەویشمان هەبوو، زۆرجاریش حاجی تۆفیق دەستپێشخەری دەکردو هەتا من ڕێدەکەوتم ئەو بەخۆی و گۆچانەکەیەوە بەدەم زیکرو یادی خواوە پەیدا دەبوو، خێزان و منالێ هەرکەس خۆشحاڵی خۆی دەردەبڕی و دەیان وت: خاڵە تۆفیق هات خاڵە تۆفیق هات .

بەڵێ هەر لەدوورەوە پێش ئەوەی بگاتە لامان ودەست و مۆست بکەین بەشیعرو هەڵبەست بەخێرهاتنی دەکردین و خۆشحاڵی خۆی بەهاتنمان دەردەبڕی .

پیاوێکی نەخوێندەوار بوو، بەڵام هەتا بڵێی زیرەك و قسەزان و بیرتیژ بوو، شیعرو بەسەرهات و چیرۆکی زۆری لەبەربوو، لەزمانی هەمووکەسی دەزانی، زۆر کەیفی بەمەلاو شێخ و خەڵکی خواپەرست دەهات، و زۆر لەخوا دەپاڕایەوە بەئیمانەوە بمرێت، هەرلە گەنجییەوە بەڕەنجی شانی خۆی ژیاوەو بەردەوام هەتا تەمەنی ۹۰ نەوەد ساڵیش هەربە پەنجە زبرو

باسکە بارێك و لەشە سوکەکەیەوە ڕەنجی ئەداو باخوباخاتی بەرهەم ئەهێنا، مازو بەرهەمی کێوی دەکردو دەیفرۆشت، دەیفەرموو: باهەتا خۆم دەتوانم هەوڵ بدەم و بەڕەنجی شان و عارەقی ناوچەوانی خۆم بژیم و نەبمە بار بەسەر کەسەوە.

زۆرجار بۆی دەگێڕاینەوە، دەیووت: ڕۆڵە من کوڕە هەژار بووم و مینای هاوسەریشم کچە دەوڵەمەند بوو، منیش زۆر توڕەو لەسەربووم، زۆر جار بەینمان تێکچووە، بەڵام زۆری نەخایاندووە ئاشت بوینەتەوە، لەماوەی هاوسەریماندا کەلە شەست ساڵ بەرەو ژوورە هەرگیز یەك ژەم لەماڵی ئێمە بە عاجزی نان نەخوراوە، هەرلەگەڵ قسەکانی خۆیدا پرسیاری لەخۆی دەکردو ئێمە قسەمان نەدەکرد، دەیوت: دەی بڵێن: تۆفیق تۆ کوڕە هەژاربوی وزۆر توڕەبوی و لەماوەی شەست و ئەوەندە ساڵیشدا لەگەڵ پورە مینادا[1] ژەمێك بە عاجزی نانمان نەخواردووە؟

دەیوت: کاکە مەلا! ئەگەر بەیانی بەینمان تێکچوایە، کە نیوەڕۆ نان و نیوەڕۆژەکەی بۆدادەنام و دەستم بۆ نانەکە دەبرد پارووەکەم بۆ نەدەبرا بۆ دەمم، دەموت چۆن مینا عاجز بکەم و خۆم خەجاڵەتی لای خواو پاشان خەجاڵەتی لای خەزوریشم بکەم؟ من نان بخۆم و مینا عاجز بێت و دڵی پڕ بێت لەخەم، بەخوا نابێ تۆفیق بەبێ مینا نان بخۆی، ئیتر خێرا بانگی مینام دەکرد، مینا هۆ مینا! دەوەرە نانەکەم لەگەڵ بخۆ بەخوا بەبێ تۆ بۆم قوت ناچێ، ئەویش دەیوت: ئەی شەڕمان نەبووە؟ دە واز

---

[1]-بەزمانی ئێمەوە دەیوت پورە مینا، چونکە خزمان بەگشتی بە (حاجی ژنە) مینایان دەوت پورە مینا.

بێنە نانی خۆت بخۆ، دووبارە دەموت: دەکچێ وەرە! ئاخر بەخوا بەبێ تۆ بۆم قوت ناچێ، ئینجا مینا دەهاتە سەرسینیە نانەکەو منیش ماڵەکەم لێ ڕووناك دەبوویەوە وبەیەکەوە بەدەم پێکەنینەوە نانەکەمان دەخوارد وگەردنی یەکترمان ئازاد دەکرد. ئەمەش تەمەنی ڕۆژوو دوو ڕۆژوو مانگ و دوو مانگ نەبووە بەڵکو نزیکەی شەستساڵ بەرەو ژوور بووە .

لەکۆتایی تەمەنیدا دوعاکانی چەند ساڵەی گیرا بوون کەئەمەش هەندێکیانن:

١. خوایە هۆم نەخەیتە کەس بەتایبەتی هۆم نەخەیتە نامەرد. بەدرێژایی تەمەنی بەڕەنجی شان و عارەقی ناوچەوانی ژیاو دەیوت: دەستی خۆم دەبڕم و لەکەسی پان ناکەمەوە، یان دەیوت: گۆشتی لاڕانی خۆم دەخۆم ومنەتی قەساب هەڵناگرم .

٢. خوایە کوڕو کچەکانم دامەزراو بکەیت لە سەر دینی ئیسلام . سوپاس بۆ خودا کوڕوکچەکانیشی هەموو ڕوو لە خوان.

٣. خوایە کەنەفت و زەلیلی سەرجێگام نەکەیت، خوایە وام لێنەیەت کوڕەکانم و خزمەکانم لەدەستم وەڕز بن. ئەوە بوو تەنها یەك شەو لەسەر جێگاکەی کەوت، شەوی (٢٢) لە سەر (٢٣)ی (٢٠١٢/٣)، بۆبەیانی سەعات نۆ گیانی سپارد .

٤. خوایە بەئاسانی گیانم دەرچێ وزەلیلی سەرەمەرگ نەبم، زۆر بە ئاسانی گیانی دەرچوو، وەکو دڵۆپە ئاو لەزاری گۆزە بکەوێتە خوار، من لەوکاتەدا دەستم بەڕادیۆکەدا ناو هەڵمکرد، یەکەم

ئایەت ئەم ئایەتەی خوێند: (والناشطات نشطا)[1]، هاوکات جەرەسی مۆبایلەکەم لێیدا وەهەڵمگرت، وتیان: مامۆستا ئەوا ئێستا حاجی تۆفیق گیانی سپارد .

بەڵێ لەرۆژی هەینی ٢٠١٢/٣/٢٣ سەعات نۆ بەرەحمەتی خوا چوو .

## درەختی خۆشەویستی لەسەر بەردیش دەڕوێ

زۆرجار تەرزەنەمامێکی ناسك و جوان لەگۆشتەگلێکی نەرم و نۆلێ و ئاودارو پڕ وزەو پەین و پاڵدا رەگ داناکوتێ و گەشە ناکات، لەهەمان کاتدا رێدەکەوێ چڵەنەمامێك یان ڕیشکە دارێك لەسەر بەردێك بەبێ ئاو و جۆگەو جۆگەلە رەگ دادەکوتێ، مەگەر بارانی خوایی ئەگەرنا دڵۆپە ئاوێك نابینێ، منیش هەموو جارێك کەدەچمە شارباژێڕ ئەو چڵە دارەبەنە بەسەر دەکەمەوە، کەلەسەر گابەردێکی گەورە ڕواوەو وەکو سنگ و مێخ رەگ و ریشی بە تەوقەسەری ئەو تاشە بەردەگەورەدا داکوتاوەو تاشەبەردەکەش لەسەر تەوقی سەری داناوە، باوەڕ بکەن لە هەموو دارو درەختی دەوروبەری سەوزو گەش و ئاودارترە[2].

دڵی رەق لەبەرد رەقترەو هیچ جۆرە بەزەیی و سۆزو میهرەبانیەك کاری تێناکات، بە درێژایی مێژووش داستان و خوێنڕشتنی دڵڕەق و

[1]- سورە النازعات ٢ .

[2]- ئەم دەرختە لە سوورەقەڵاتە، لە شارباژێڕ .

بێبەزەییەکان بینراوەو بیستراوە، چەند منداڵیان هەتیو کردووەو چەند ژنیان بێوەژن و چەند پیاویشیان بێ ژن کردووە، چەند دەستگیرانیان لەیەك کردووە، چەندین ئافرەت و پیاوو کوڕو کچ و منداڵیان کوشتوەو لەناو بردوە. چەند منداڵی ساواو شیرەخۆرەیان زیندەبەچاڵ کردووەو لەبرسان و لەتینواندا کوشتویانن، هەر لە گەلی عادو سەموودو فیرعەون و نەمرودەوە تا صەدام حسین و حافز ئەسەدو بەشاری کوڕی و قەززافی دڕندەو دارو دەستەکانیان.

ئیتر هیتلەرو ستالین و مۆسۆلۆنی و سەدان کەسیتر بوەستێ، کە بەناوی پێشکەوتنخوازی و ڕزگارکردنی مرۆڤ و سەروەری یاساو..... سەدان درۆو دەلەسەو چاوبەستی جۆراو جۆرەوە، بە ملیۆنەها مرۆڤیان لەناوبردووە، کە مێژوو شەرم دەکات خۆی بکاتە خاوەنی، ئەو دڵڕەقانە بێخێرترن، لە گابەردێك کە باوەش بۆ ڕەگی ناسکی درەختێك ئەکاتەوەو پێیدەگەیەنێت! ئەمەیە ئەبینین لەسەر بەردی ڕەق نەمامی ناسك و سەوز و ئاودار گەشە دەکات ودەڕوێ.

لەگەڵ مامۆستا (ئەبوکری صدیقی) بەلای گوندێکدا تێپەڕین، وتی: ئەمە گوندی قەڵەم پاشایە، لەم گوندە پیاوێك هەبوو سێ ژنی هەبوو، هەمووشمان دەزانین دوژمنی سەرسەختی هەوێ هەوێکەیەتی، کەپێی ناخۆشە دوای مردنیشی باسی هەوێکەی بکەن. عائیشەی دایکی بڕواداران (ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرموێت: چەند ساڵ دوای مردنی خەدیجەی دایکی بڕواداران، پێم ناخۆش بوو پێغەمبەر (ﷺ) باسی بکات یان وەسفی بکات.

بەلام ئەم سێ ژنەی ئەم پیاوە ناسیاوەی من زۆر بەینیان خۆشبوو، بەتایبەتی دوانیان بەبێ یەك نەدەژیان، بەقوربانی یەکتر دەبوون، یارمەتی یەکتریان ئەداو بەدەم یەکەوە بوون، وەسفی یەکتریان دەکرد، بەناخۆشی و غەمباری یەکتر خەفەتبار دەبون، تەنانەت کەسوکاری یەکتریشیان خۆشدەویست و هۆگری یەکتربوون، بەئەندازەیەك یەکتریان خۆشدەویست و هۆگری یەکتربوون هەرکەس بیزانیایە پێیان سەرسام دەبوو، ئەم خۆشەویستیە لەدڵی هەوێیەکدا چەکەرەی کردوەو ڕەگی داکوتاوە بەرامبەر هەوێکەی، بەڕاستی ئەم خۆشەویستیە کە لە شوێنێکی سەخت و ڕەق و دژواردا ڕەگی داکوتاوە، زۆر هونەرترو سەیرو سەرسوڕهێنەرترە لە سەوزبون و گەشەکردنی درەخت لەسەر تاشە بەردی ڕەق و پۆلایین.

بەلام ئەم دوو هەوێیە خۆشەویستیەکەی نێوانیان سەلماند، هەروەك پەروانە لەیەککاتدا لە دەوری یەك چراو شەمدا هەردوکیان بونە قەرەبروت، یەکێك لەم دوو هەوێیە مۆڵەت لە هاوسەری دەخوازێ کەبچێتە چوارقوڕنە لە دەڤەری بیتوێن و یارمەتی ماڵی باوکی بدات، بەتایبەتی بۆ نانکردن بۆدایك و باوکی پیرو پەککەوتەی، ئەوی تریشیان زۆر داوا دەکات پیاوەکەی مۆڵەتی ئەویش بدات، لە گەڵ هەوێکەیدا بەیەکەوە بچن نان بۆ ماڵی باوکی بکەن، بەڵێ لەسەر داواو لالانەوەی هەردوکیان هاوسەرەکەیان ڕێگە ئەدات هەردووکیان بچن، بۆخۆشی دەچێ بە ڕێیان دەکات، دەیانگەیەنێتە چوارقوڕنەو خواحافیزیان لێدەکات.

ئەو شەوە بە پێکەنین و قسەی خۆش بەسەر دەبەن، بەیانی زوو هەردوکیان ڕاستدەبنەوەو هەویر دەشێلن و پەرەمێز دادەگیرسێنن و دەستدەکەن بە نانکردن، لە پڕ پەرەمێز دەکوژێتەوە، ئەوانیش هەر بە گەرمی دایدەگرسێننەوە و یەکسەر گڕ دەگرێت و هەردوو هەوێی خۆشەویست پێکەوە گڕ دەگرن و دەسوتێن و دەمرن، ئیتر هەر لەوێ تەرمی هەردووکیان دەشۆن و بەتەنیشت یەکەوە ئەسپەردەی خاکیان دەکەن، ئێستەش گڵکۆیی هەردووکیان بە تەنیشت یەکەوەیە، هەتا ڕۆژی زیندوبونەوەش دراوسێی یەك دەبن.

## ئەم خۆشەویستییە لە چ قوتابخانەیەکەوە فێربوون؟

لە شەستەکاندا ماڵمان لە گوندی ڕەشانی "شێخ عثمانی ڕەشانی" بوو، بەرامبەر گوندی (کوڕەمێوەی) ناوچەی پێنجوێن. باوکم مەلای گوندەکە بوو، لە گەڵ خەڵکی گوندەکە کە زۆر گونجاوو خزم دۆست و خواپەرست بوون، زۆر بەتەنگ حەڵاڵ و حەرامەوە بوون، بێئەندازە ڕێزی مەلاو کەسایەتی دینیان ئەگرت، لە ساڵی (١٩٦٢)دا گوندەکە لە لایەن سوپاو چەکدارە کوردەکانی سەر بەڕژێم سوتێنرا، ئێمەش لە گەڵ دانیشتوانی گوندەکە دەربەدەرو ئاوارە بووین و لە شارۆچکەی مەریوان گیرساینەوە.

ئەو سەردەمە لەشاری مەریواندا تەنها لە دوو مزگەوتدا نوێژو وتاری هەینی دەکرا، شێخ الاسلام وتاربێژی مزگەوتی گەورەی مەریوان بوو،

باوکیشم کرایە وتاربێژی مزگەوتی داسەیران و خانویەکیشیان بۆ مامۆستای مزگەوت کڕی، ئەو کاتە خانووەکەیاندا بەباوکم و ئەوەندەی لەویێ بووین لە خانوەکەدا حەواینەوە.

بەرامبەر دەرگای ماڵی ئێمە تاقە ژوورێکی بچوك هەبوو بە قوڕو بەرد دروستکرابوو، سەربانەکەشی بە دار دارەڕا کرابوو، لە کاتی سەرمای زۆردا دەرگای ژوورەکەیان بە پێچەن دادەخست، لەم خانوەدا پیاوێك دەژیا بە ناوی (کاك محمد) نازناوی "حەمەعاسی" بوو، پێنج فەرزە لە مزگەوت بە جەماعەت نوێژی دەکرد، زۆر شەویش بۆ شەوچەرەو دانیشتن دەهات بۆ لای باوکم، شەوێکیان[1] لە گەرمەی قسەکردندا وتی: ئەرێ مامۆستا من لەم تەمەنەدا دروستە ژن بهێنم؟ باوکم فەرموی: جا "مامەحەمە" کەست دەستدەکەوێ؟ وتی: بەڵێ: بە گەنجی حەزم لە ئافرەتێك دەکرد بەڵام بە نسیب نەبوو ببێتە هاوسەرم شووی کرد، بەڵام ئێستا هاوسەرەکەی مردووەو بێوەژن کەوتووە، منیش خۆت دەزانی هاوسەرەکەم مردووە، بەخوا مامۆستا بەینی خۆمان بێت من و شیرین خانم ڕێککەوتووین و دەڵێ: من ڕازیم، ئەگەر جەنابی مامۆستا ئەرکی ئەوەی بکێشایە محمدی کوڕمی ڕازی بکردایە. مامەحمە وتی: ئیتر مامۆستا من داوام لە بەڕێزت ئەوەیە قەناعەت بە محمدی کوڕی بکەی بە هەر جۆرێك بێت.

مامۆستا فەرموی" مامەحەمە" با بڕۆین بۆ لای کاك محمدی کوڕی پورە شیرین بەڵکو خوا ئاسانی بکات، با بڕۆین پشت بەخوا.

---

[1] لە زمانی مامۆستا (سیدعلی سیدعبدالواحد)ەوە نوسیومەتەوە، شەوی پێنجشەممە (٢٤ – ٢٥ /٤/ ٢٠١٢).

بەڵێ باوکم و مامەحەمە چوون بۆ ماڵی کاك محمدو باوکم سەرباسی بابەتەکەی کردەوە، لەسەرەتاوە کاك محمد زۆری پێناخۆش بوو، بەڵام وردە وردە باوکم بە قسەی نەرم و خۆش هێوری کردەوەو وتی: ڕۆڵە کوڕی خۆم ئەم ژن و پیاوە دووکەسی گەنج نین لەبەر ئارەزوو هاوسەرگیری بکەن، بەڵام ژیان بەتەنیا خۆش نیە، ئەمانیش لە لای یەکتر دەحەوێنەوەو ئەرکێکیش لەسەرشانی ئێوە سوك دەبێ، محمد نەرمبوو، لەم قسانەدا بوین پورە شیرین خۆی کرد بەژوورا، ڕووی کردە محمدی کوڕی وتی: ڕۆڵە خۆ ئێمە لەبەر ئارەزوو ئەو شتانە نیە ئەم کارە دەکەین، بەڵام من سبەینێ پەکم دەکەوێ ئێوە منتان پێ خزمەت ناکرێ، هەندێ قسەی تری کرد کە هەمویان بۆنی ڕەزامەندی و خۆشحاڵیان لێدەهات بەو هاوسەرگیرییە.

بە ناچاری کاك محمدی کوڕی پورە شیرین ڕوویکردە باوکم وتی: جا مامۆستا ئەگەر شەرع ڕێگە بدات منیش ملم لە موو باریکترەو ڕازیم، موبارەك بێت.

ئیتر مامەحەمەو پورەشیرین لە خۆشیاندا گەشکەیان لێدەهات، پەلەپەلیان لەکارەکەدا کرد، خوازبێنی و دەستماچکردن و مارەکردن و گواستنەوە هەمووی سێ ڕۆژی خایاند، خەڵکی گەڕەك و خزم و خوێش و دۆست و ناسیاو سەریان لە هۆگری و بەینخۆشی نێوان ئەم`دوو هاوسەرە سوڕما بوو، ڕێزگرتن و زمان شیرینی و خۆشەویستی نێوان مامەحەمەو پورەشیرین بووە مایەی سەرسامی دۆست و دوژمن و بوو بە بەستەی سەرزمانی خەڵکی.

لەو گەڕەکەدا تەنها ماڵی ئەوان ئاویان هەبوو، تەواوی خەڵکی گەڕەك لە ماڵی ئەوان ئاویان دەبرد، دەستیان بەرووی کەسەوە نەدەنا، لەگەڵ خەڵکدا ڕووخۆش و زمان شیرین و گفتوگۆخۆش بوون، کە مامەحەمە لە ماڵ دەچووە دەرەوە بۆ شوێنێك، ژنەکەی خێراخێرا دەهاتە بەردەرگاو بەدەم دوعاکردنەوە بەلای راست و چەپدا ئەیڕوانی و دەچووە ژوورەوە، لەدوای پێچی مێزەرێك خۆی پێنەدەگیرا لەسەر سوچی دەرگاوە دووبارە سەری دەردەهێناو بەهەمان شێوەی جاری پێشوو، زۆرجار پرسیاری لە خەڵکیش دەکرد دەربارەی هاوسەرەکەی.

خۆ ئەگەر پوورەشیرین لە ماڵ دەرچوایە مامەحەمە حاڵی خۆشتر نەبوو، لە حەوشەو سەرکۆلان هەردەهات ودەڕۆیی و پیاسەی ئەکردو شیعرو هۆنراوەی خۆشی بەسەردا ئەوت و ملی بۆ ئەملاوئەولای کۆلان درێژ دەکرد، و چاوی لە ڕێگەوبان دەبڕی بەڵکو پوورەشیرینی تازە بووك سەرهەڵدا.

پوورەشیرین و مامەحەمە زۆر هاتوچۆی ماڵی ئێمەیان دەکرد، هەموو جارێ دایکم دوعای بۆ پوورەشیرین دەکردو ئەیفەرموو: یاخوا شیرین بەهەشتی بیت و خوا لێت خۆش بێت، ئەویش دەیوت: توخوا مامۆستاژن هەرکات دوعات بۆ من و محمدی هاوسەرم کرد، ئەم دوعایەشمان بۆ بکەو بڵێ یاخوا بەیەك ڕۆژ بمرن و کەستان ئەوی ترتان بەجێنەهێڵێ.

بەڵێ ڕۆژانە پیاوی گەڕەك دەهاتنە دەرەوە بۆ دانیشتنی بەربەرۆچکە "سەکۆی خەڵکی گەڕەك"، ڕۆژێکیان درەنگ بوو، خەڵکی گەڕەك هەموو هاتنەدەرو سەلام و کەلام و مەرحەباو قسەی خۆش دەستی پێکرد، بەڵام

مامەحەمەو پورەشیرین هیچیان دیار نەبوون، چەند جارێك خەڵكی گەڕەك و برادەر بانگیان کردن، بەڵام وەڵام نەبوو، زۆریان بۆ هات، دەرگایان بەزۆر کردەوە، کە سەیریان کرد مامەحەمەو پووره‌شیرین لە سەر دۆشەکەکەیان و لەژێر بەتانیەکەیاندا دەست لەملان هەدوکیان گیانیان دەرچوو بوو! هیچ هۆکارێکی مردنیشیان دیار نەبوو، تەنها خەڵکی دەیان وت: خوا ئاواتی هێناونەتەدی، کەداوایان لە خەڵکی دەکرد دوعایان بۆبکەن بەیەك ڕۆژ بمرن.

ئیتر هەمان ڕۆژ هەردوو تەرمەکە شۆران، و لەگۆڕستانی داسەیران لە مەریوان لە تەنیشت یەکەوە ئەسپەردەی خاك کران، باوکم"مامۆستا سیدعبدالواحد" تەڵقینی هەردووکیانی کرد، ئێستاش بچمەوە ئەو گۆڕستانە لەوانەیە گڵکۆی گۆڕەکانیان بناسمەوەو دیمەنی سەرنجڕاکێش و قەشەنگی ئەو دوو هاوسەرەم بێتەوە بەر چاو.

## بەفەرمانی پێغەمبەر (ﷺ) خانووەکەمان بۆ دروست کرد

(حاجی تۆفیق أمین)ی کوڕەداوێ (خوا لێی خۆش بێت) بۆی گێڕامەوە[1] وتی: لە ساڵی (١٩٢٧)وە مەلایەکمان هەبوو بەناوی مامۆستا (سەید عبدالله واژەیی)[2]، تا ساڵی (١٩٤٥)، واتە: هەژدە ساڵی ڕەبەق مەلامان بووە لە گوندی کوڕەداوێ، زۆرمەلایەکی خواناس و خۆش گوفتارو خۆش مەجلیس بوو، بەردەوام دەمی بەیادی خواوئایەت و حەدیس و ئامۆژگاری بوو، تەواوی گوڵستانی سەعدی بەشەوانی زستان لەبەرسۆپای دیوەخانی مزگەوت لەزستانا بۆ دەخوێندینەوە وبۆی دەکردینەوە بە کوردی، بەڵێ (١٩٤٥ کوڕەداوێ)ی بەجێهێشت، چووە شاری سلێمانی ولەهەوڵی خانووکردندا بوو، بەڵام دەستکورت بوو، خێزانیشی زۆر بوو، زۆر بەگران خانووکردنەکەی بە دەستەوە دەهات .

لەو سەروەختەدا پیاوێکی گوندی کوڕەداوێ بەناوی (گوڵ محمد) دەچێتە سلێمانی و چەند ڕۆژێك دەمێنێتەوە، دواتر کە گەڕایەوە بۆ کوڕەداوێ لەبەر سۆپای دیوەخانی مزگەوت وتی: خزمینە من ڕاسپاردەیەکم پێیە پێتان ڕادەگەیەنم ئێوەش خۆتان و ئیمانتان، وتمان فەرموو: وتی: هەریەکەم شەو کە لە سلێمانی بووم خەوم بە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بینی، فەرمووی: بڕۆ بەخزمانی کوڕەداوێ بڵێ یارمەتی مەلا

---

[1] بۆ نووسەری بابەتەکە (مەلا ئەحمەدی شەریعە) گێڕاوەتەوە.

[2] مامۆستا (سید عبدالله) باوکی مامۆستا شێخ (لەتیفی واژەیی)ە، کە زانایەکی ناودارو ئەندامی مەکتەبی سیاسی بزوتنەوەی ئیسلامی بوو، ساڵی (١٩٩٤) لە ئێران بە کارەساتی سەیارە گیانی سپارد.

سەیدعبداللە بدەن و خانووەکەی لەگەڵ دروست بکەن، بەڕاستی کە بەیانی هەستام، وتم: خەڵك هەژارەو ئەمەش خەوە، کوڕە بەخوا باسی ناکەم .

بەڵام بەخوا خزمینە شەوی دووهەمیش هەمان خەوم لەهەمان شوێن بینی و خەریك بوو پێغەمبەر (سەلات و سەلامی خوای لەسەربێت) لێشم عاجز بێت، بۆیە وەعدم پێدا کەئەمجارە پێیان دەڵێم، بەڵام ئەمجارەش نەفس و شەیتان لەخشتەیان بردم و باسم نەکردو تەمەڵیم تێدا کرد .

بڕوابکەن خزمینە سوێنتان لە سەرم نیە شەوی سێیەمیش هەمان خەونم لەهەمان شوێن بینیەوە و ئەمجارە پێغەمبەر (سەلات و سەلامی خوای لەسەربێت) بەجۆرێك لە ناڕەزاییەوە فەرمووی: بۆ بەخزمانی کوڕەداوێت نەوت یارمەتی مەلاسەید عبداللە بدەن؟ ئەی چیم پێ وتی؟ ئیتر وەعدی تەواوم پێدا کە پێتان ڕابگەیەنم ئیتر ئەوا پێم ڕاگەیاندن، ئێوەش خۆتان و غیرەتتان، بەم شێوەیە داری دارەڕایان هێناو خانووەکەیان بۆ دروست کرد .

# ئەو ڕۆژە نەفسی نەفسی بوو
# مەردیش لە مەیدا نادەردەکرێت

دوای نانخواردن دەستکرا بە قسەکردن و وتاردان[1]، دواتر باسی پرۆسەی ئەنفال و زوڵم و زۆر و ڕەشەکوژی حیزبی بەعسی سۆشیالیست کرا، لەناو دەیان باسی جەرگبڕو بەسەرهاتی کوشتوبڕو دڕندەئاسا، شێخ ئیکرام وتی: منیش هەرچەند خێزان و کەسوکاری نزیکم دەرباز بووبون، بەڵام خۆم گەیاندە ناوچەی قەرەداغ بۆ یارمەتی خەڵکی و ڕزگاری کردنی کەسانی بێدەرەتان، کاتێك بەتاریکە شەو لە گوندی بەڵخەوە بەرەو گوندی بەلەکجار ڕۆیشتم کە ئەو کاتە مەڵبەندی یەکیەتی لەوێ بوو.

سەیرمکرد مەڵبەند چۆڵکراوەو گوندەکە ڕۆح لەبەرو گیانلەبەری تێدا نەمابوو، ناودێ زۆر کشومات و خامۆش بوو، زۆر دیمەنێکی سامناك و ترسناکی هەبوو، چەند ڕۆژێك لەوەوبەر مەڵبەند پڕبوو لە پێشمەرگەو ناودێش جمەی دەهات لە پیاوو ژن و منداڵ، و بەسەدان سەرمەڕو بزن و مانگای تێدابوو، هەموو سەرباخ و باخات و کانی و ئاوەکان ئاوەدانی لێبوو، خەڵکی سەرگەرمی کاسبی و کشتوکاڵ و باخداری و مەڕداری و شوانکاری بوون، بەڵام تەنها دوای ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ ئاوا بایەقوش و کونەپەپو تێیدا دەخوێنێ و دەڵێی سەد ساڵە ئاوەدانی بەخۆیەوە نەبینیوە، هەرچەندم کرد بڕوام نەدەکرد ئەم قەرەباڵغییە تەنها کەسێکی

---

[1] ڕۆژی هەینی ڕێکەوتی (٢٠١٢/٥/١٧) لە گەڵ کۆمەڵێك کەسایەتی و دۆست و برادەر میوانی کاك (شێخ ئیکرام) بووین لە گوندی بەڵخەی قەرەداغ.

لێنەمابێت پارچەیەك نانی لێوەرگرم، زۆر گەڕام بەناو ئاواییدا بەلام چۆڵ و کپ و بێدەنگ و سامناك بوو.

لەکاتی گەڕانەکەمدا سەرمکرد بە خەستەخانەکەدا، بینیم کوڕێکی گەنج قاچێکی بڕاوەتەوەو لە سەر قەرەوێڵەیەك ڕاکێشراوەو ئاوی بۆ هەڵواسراوە، کە ئێمەی بینی وتی: ئەریٚ بۆ کەس نایە بە دەنگی کەسەوە؟ پزیشك و دکتۆر و معاون توبێك، کەسێك نایە بەلامەوە؟ ئەوە بۆ کەس دەنگی نایە؟ نەیدەزانی کە گوندو مەڵبەندو خەستەخانەو ناوچەکە هەمووی سەرتاپا چۆڵی کردووە، خەڵکی وەکو پەپولەی پەراگەندەیان لێهاتووە، هەرکەسە مالومناڵی خۆی پێشخۆی داوەو مل دەنیٚ بیٚ ئەوەی بزانی بۆ کویٚ دەچیٚ؟ منیش کە دیمەنی ئەو کوڕە گەنجەم بینی ئاوا بەجێماوەو ئاگای لە هیچ نیەو منیش هیچم لەدەستنایە بۆی بکەم، ئاگر لە جەرگم بەربوو، فرمێسك بە چاومدا هاتە خوارەوە، ئیتر چومە دەرەوەو دام لە پرمەی گریان، جا لەبەر ئەوەی نەمدەزانی چی لێبکەم وکەسوکاری لە کوێن ناچار بەجێمهێشت، دواتر وتیان: لە پشتی ئاواییەوە لێپرسراوی پێشمەرگەکان فەرمانی دەرکردبوو بەبیٚ دواکەوتن زۆر بەخێرایی بڕۆن بەرەو گەرمیان، لەوکاتەدا پێشمەرگەیەکی مەردو بە ئەمەك ڕوودەکاتە فەرماندەکەیان و دەڵیٚ: من لێرەوە لە ئێوە جیادەبمەوەو لەگەڵ ئێوە نایەم، دەچم بۆلای ئەو برا پێشمەرگەیەم کە چەند ساڵە هاوسەنگەرو دۆست وخۆشەویست و هاوڕێی ناو سەنگەرم بووەو ناهێڵم ئاوا بە ئاسانی و بە زەلیلی بکەوێتە بەردەستی دوژمن، دەڵێن: کاکە هەر ئەو بریندارە لە ناوبچێت باشترە، وازبێنە خۆ ئێمەش

خەفەتی لێدەخۆین بەڵام هیچ چارمان نیە، بەیانی زوو سوپاو جەیشوجاش ڕوودەکەنە ئێرەو ناوچەکە دەسوتێنن، تۆش وازبێنەو بەدەستی خۆت خۆت مەخەرە ناو ئاگر.

بەڵام ئەو کوڕە مەردە گیانی خۆی خستە سەردەستی لەپێناوی هاوسەنگەرەکەیداو وەفاداری خۆی بۆ هاوڕێکەی سەلماند، بەو شەوە چوو بوو لە خەستەخانەکە دەریهێنابوو، دابوی بە کۆڵیدا دێ بەدێ و بە شیوو دۆڵ و هەوراز و نشێوی ئەو ناوچەدا بە برسیەتی و هەناسەساردی هێنابوویە ناوچەی بازیان، لەوێوە گەیاندبوویە ناو شارو ڕزگاری کردبوو، خواش ئەوی ڕزگار کرد. ئیتر لە سلێمانی بەدزییەوە تیماریان دەکرد تا برینەکەی ساڕێژ بوو. دواتریش بەهۆی ڕاپەڕینەکەوە خوا دەرو دەروازەی خێری لە هەمووماں کردەوە.

شێخ ئیکرام کە قوڕگی پڕبوو لە گریان، چاوی پڕ لە فرمێسك بوو، وتی: هەر هەمانشەو تکاو ڕجام لە خەڵکەکە کرد بەرەو گەرمیان نەڕۆن، بەڵکو بە بناری قۆپیەکاندا بڕۆین هەتا کەمێك لە سلێمانی نزیك ببینەوە، ئیتر خۆم پێشیان کەوتم نزیکەی پێنجسەد کەسێك دەبوون شوێنم کەوتن، هەتا گەیشتینە دەروبوری تانجەڕۆ زۆربەیان ڕزگاریان بوو، هەندێکیشیان بوونە نێچیری جنگ و نینۆکی سوپا.

بەڵام شتێکی ترو دیمەنێکی جەرگبڕی ترم بینی کە هەرگیز بڕوا ناکەم لە بیر بچێتەوە، کاتێك بە تاریکە شەو بەناو ئەو شاخ و داخ و دارو بەردە دارستانەدا سەدان کەس لە ژن و منداڵ و پیاوو گەنج و پیرو ساخ و نەخۆش بەترس و لەرز و برسیەتی و تینویەتی ڕومان لەو شاخ و تەلان و

هەڵدێر و نشێوو دژڵەکردبوو، لەو کاتە گوێم لە نوزەی پیرەژنێك بوو لە دەورووبەری خۆمان لە پەنایەکدا دانیشتبوو، لەبەرخۆیەوە بە دەنگێکی پڕ ترس و خەفەتەوە دەیوت: ئەریٚ خەڵکینە ئێوە دەڕۆن ئەی من چی بکەم؟ کە لێی چومە پێشەوە بینیم هەردوو چاوی کوێرەو نابینایە، بردوویانەتە ئەو قەراغ دێیەوە هەندیٚ ئاوو خواردنیان لەبەردەم داناوەو بەجێیان هێشتووە، ئەو کە گوێی لە خشپەو دەنگی پێڵاوو ڕۆیشتنی خەڵك بوو خێراخێرا دەیوت: ئەریٚ خەڵکینە ئێوە دەڕۆن من چی بکەم؟ خەڵکینە ئەریٚ توخوا ئێوە دەڕۆن من چیبکەم؟ هیچی تری نەدەوت، ئیتر ئەوە ئەوپەڕی تواناو دەسەڵاتی بوو، زۆر خەفەتم لەویش خوارد، بەڵام هیچ دەسەڵاتم نەبوو، هەروا بە هەناسەساردی و بێکەسی بەجێمان هێشت.

## دڵی مردوو کەسوکاری مردووەکەمان خۆش کرد

چاکەکردن ودەروکردنەوە لە بێدەسەڵات و بێکەس و بێنەوا خێری زیاترە لە چاکەکردن لەگەڵ کەسی دەسەڵاتدار و خاوەن کەس و دەست ڕۆیشتوو، چاکەکردن لە کاتی تەنگانەو لیقەوماویدا خێری زیاترە وەك لە کاتی زاڵبوون دەسەڵات و هێز و توانادا، چاکەکردن لەگەڵ بێزمان و بەستەزمان و داماو خێری زۆر زیاترە لە چاکەکردن لەگەڵ خاوەن دەموزمان و سکاڵاکار و خاوەن پەنا.

مامۆستا مەلا حەمەیوسف لە مامۆستایەکی پایەبەرزی کوردستانی ئێران بەناوی مامۆستا مەلاعەلادین گێرایەوە وتی: لە گەڵ تەرمی مردوێکدا دەچێتە سەر گۆڕستان بۆ ئەسپەردەکردنی، کاتێك تەرمەکەیان خستە گۆڕەکەوەو گڵیان بەسەردا کردو ئەسپەردەی خاك کرا، مامۆستا ڕووی کردە ئامادەبوانی سەر گۆڕەکەو وتی: خەڵکینە! ئەم مردوە ئێستا زۆر پێویستی بە دوعاو گەردن ئازادی ئێمە هەیەو دەنگی نامانگاتێ، دەنا تکاو ڕەجای لێدەکردین کە دوعای خێری بۆ بکەین و گەردنی ئازاد بکەین، چونکە مردوو وەکو ئەو کەسەیە ئاو دەیبات و لە تاو ڕۆحی خۆی دەست بۆ چڵەگیاو چڵەپوشی قەراغ ئاوەکە دەبات.

ئینجا فەرمووی: بەخوا خەڵکینە خۆ ئەم مردووە زۆر ستەمی لەمن کردووە، زۆر خراپەی دەربارەی من کردوە، بەڵام ئێستا لەبەر ئەوەی زۆر پێویستی بە ئێمە هەیەو هیچ دەسەڵاتیشی نیە، ئەوا من لەبەر خوا گەردنی ئازاد دەکەم، دەی توخوا ئێوەش هەموو گەردنی ئازاد بکەن و دوعای خێری بۆ بکەن بەڵکو خوا لێیخۆش بێت. ئێستا ئێمە چاوەڕێی هیچ چاکەو پیاوەتیەکی ئەو نین و هیچ مەبەستێکمان پێی نیە تەنها لەبەر خوا ئەو کارە دەکەین، ئیتر سەر گۆڕستان بوو بە کۆڕی ئاشتەوایی و لێخۆشبوون هەموو بەیەکجار لەبەر خوا گەردنیان ئازاد کرد، بەڵام چی لێخۆشبوونێك.

لێخۆشبوونی لایەنێکی بەدەسەڵات قسەو دەست ڕۆیشتوو لە کەسێکی بێ دەسەڵاتی بێ دەست و زمان و بێچارەی مردوو.

خۆزگە ئەوەندەی ئەو مامۆستا بەڕێزو خواناسە و هاوڕێکانی و شاگردەکانی چاکەیان لەگەڵ ئەو مردوە کرد، ئێمەش ئەوەندە چاکەمان لەگەڵ زیندووەکان بکردایە لەبەر خواو بە بێ بەرامبەر و بێ ڕیایی.

## خودای گەورە پارێزگاری لەماڵی خۆی دەکات[1]

زۆر لەمێژ بوو هەوڵی حەجکردنم بوو، بۆم ڕێکنەدەکەوت، تا لەساڵی ٢٠٠٩ دا مژدەیان پێدام کە ناوم دەرچووە بۆ حەج، زۆر کەیفخۆش بووم، وامدەزانی دونیایان کردۆتە بەخششم، نەمدەزانی چۆن هەستی دڵ و دەروونم دەرببڕم، بەهەرحاڵ، ڕۆیشتم بۆ ئەو سەفەرەی خۆشترین گەشت و سەفەرم بوو لە ژیانمدا، سەفەرێك ئەگەر بە چاکی بکرێت و لە لای خودا گیرابێت، ئەوە هەر لە ماڵ دەرچووی هەموو هەڵسوکەوت و خەوو خۆراك و کردارو ڕەفتارێکت خواپەرستییە، حاجی لە گوناەو تاوان پاك دەبێتەوە، هەر وەك ئەو ڕۆژەی لێدێت کە لە دایك بووە، سەفەرێك لە کاتی گیرابوونی حەجەکەتدا پاداشتەکەی تەنها بەهەشتە، زۆر دڵم خۆش بوو، هەر لە دارو بەردی کەعبە ورد دەبوومەوە.

ڕۆژێك لەناو کەعبەدا خەریکی نوێژو تەسبیحات بووم، بینیم پشیلەیەك بە خێرایی بە ناو خەڵکەکەدا هات، منیش پێم سەیر بوو، پشیلە لێرە چی دەکات؟ خۆ ئەوە جێگەی پشیلە نیەو لەبەر قەرەباڵغی ڕێگەی نیە بڕوات، بە هەر حاڵ زۆر لێی ورد دەبومەوەو ئەویش زۆر بەخێرایی دەڕۆیشت بۆ

---

[1] لە زاری حاجی صالح هەڵەدنی خۆیەوە . ساڵی ٢٠١٢ .

ئەو سەر، بینیم پیاوێك لە سەردەم ڕاكشابوو، پشیلەكە قەپی كرد بە قاچی كابراداو كابراش بەرزە پێ ڕاپەڕی و هەستا، ئیتر پشیلەكە بە ڕێی خۆیدا گەڕایەوەو چووە دەرەوە .

تێگەیشتم كە مەبەستی ئەو پشیلەیە ئەنجامدانی ئەو ئەركە بوو پێی سپێردرا بوو، تا نەهێڵێ كەسێك بە جۆرێك لە ماڵی خودادا بخەوێت كە پێغەمبەری خوا (سەلات و سەلامی خوای لە سەر بێت) قەدەغەی كردووە.

## (كە ئەما چارە لە هیچ لایە   ئیتر نۆرەی ڕەحمی خوایە)

مامۆستای بانگخواز ئیبراهیم ڕێشاوی (خوا لێی خۆش بێت) گێڕایەوە:
كە مامۆستایەكی برادەری هەبوو كە نوێژنەكەرو خودانەناس بوو، زۆر ئامۆژگاریم دەكردو قسەم بۆ دەكرد، كەسێكی شارەزاو قسەزان بوو، نەك بڵێی كەسێكی ساویلكەو سافیلكە بێت، قسەكانی منی وەك با بە لای گوێیدا تێدەپەڕین و هیچ گوێی پێنەدەدا، منیش زۆر مەراقی ئەوەم بوو كە ئەم هاوڕێیەم بە بێ ئیمانی بڕوات و منیش لەسەر كەمتەرخەمیم بەرامبەری گوناهبار ببم، زۆر ڕێگە و شێوازی بانگەوازم لە گەڵدا تاقیكردەوە، بەڵام بێ سوود بوو.

بەڵام گومانی تێدا نیە كە خودای گەورە بەرامبەر دوژمنەكانیشی بەبەزەییە، ڕۆژێكیان لە داڵغەی ئەو مامۆستایەی هاوڕێمدا بووم و بۆ ڕێگەو شێوازێك دەگەڕام، بەڵكو خودا لە دڵی بنێت و تەوبە بكات و

ئەویش لە بێفەرمانی خوا ڕزگاری بێت و منیش پاداشتێکم دەست بکەوێت، وەفاداری خۆشم بۆ ئەو برادەرە بەڕێزەم بنوێنم.

خوای گەورە خستیە دڵمەوە لەگەڵ ئەو مامۆستایەی هاوڕێمدا بچینە سەر بەنداوی دەربەندیخان و سواری بەلەم بین و ئیتر لە ناوی بەلەمەکەدا ئامۆژگاری بکەم، چونکە شوێن و کاتێکی ترسناکە، منیش پێشتر زۆر شێوازی ترم تاقیکردبۆوە، وەکو دەڵێن بانگەوازی (بەڕ) تەواو بو سەرەی بانگەوازی (بەحرە) .

پێشنیارەکەم بە هاوڕێکەم وت زۆری پێخۆش بوو، ڕێکەوتین و کاتمان دیاریکرد. لە ڕۆژی دیاریکراودا چوینە ڕۆخی ئاوەکە و بەلەمەوانەکەم بانگکردو لەگەڵیدا ڕێککەوتین، چەندبن و بچن؟ کرێکەی چەندەیە؟ بەڵام بە نهێنی بەکابرای مەلەوانم وت: هەندێ بەلەمەکە بێنەو ببەو ئەملاو ئەولای پێبکە، ئاوەکە بشڵەقێنە، و بەخێرایی پێچ بکەرەوە، هەندێ هاوار لەخوا بکە بەدەنگی بەرز، لەسەر ئەم شێوازە ڕێککەوتین, مامۆستای هاوڕێشم لەمە بێئاگایە، ووتم بزانم لەم دیمەنەدا هاوڕێکەم هەڵویستی چی دەبێت؟

بە کەیفێکی خۆش سواربوین، بەڵام هەر ئەوەندەمان خۆش بوو لەتەنکاوەکە دوورکەوتینەوە، بەلەم کەوتە ئەملاو ئەولاو شەپۆلی بە ئاوەکە دروستدەکرد، هەمومان هاوارمان لەخوا دەکرد، بەلەم لە ناوەڕاستی بەنداوەکەدایەو نەدەستمان و نەدەنگمان بە هیچ ناگات، بۆیە بە مامۆستای هاوڕێم وت: دەی تۆش بپاڕێرەوە بەڵکو خوا لەم بەڵایە ڕزگارمان بکات، ئیتر ئەویش دەستی کرد بە نوغاو نزاو پاڕانەوە،

وردەوردە بەلەم هێواش بوەوەو دڵمان خۆش بوو، کاکی مامۆستا تەوبەیەکی باش و ڕاست و دروستی کرد، منیش بەئەندازەی هەموو دونیا دڵم بەئەنجامی کارەکەم خۆشبوو، مامۆستای هاوڕێشم کە لە هەموو هۆکارێك نائومێد بوو زانی دەستی ناگاتە ئاسمان و پێشی لە ئەرز بڕاوە هاواری بۆ لای خودا برد، ئەوسا منیش وتم: کە چارە نەما لە هیچ لایە ئیتر تۆرەی ڕەحمی خوایە ئیتر تەوبەیەکی ڕاستی کرد و پەشیمان بویەوە.

## جارێکی تر زوڵم لەمشکیش ناکەم[1]

بیستبوم سوننەتە کە ئاژەڵ و باڵندەت سەربڕی پێویستە زۆر بەسووکی و سادەیی سەری بڕی، و لە خۆڕایی ئازاری نەدەی، بەڵکو دەبێت چەقۆی بۆ بسوی و چاك تیژی بکەیت. هەروەها بیستبوم: ئافرەتێك لەچۆڵەوانی ئاوی داوە بە سەگێك بەهۆیەوە چۆتە بەهەشت، ئافرەتێکی تریش سزاو ئەشکەنجەی پشیلەیەکی داوەو بەندی کردوەو خواردنی نەداوەتێ تا لە برسێتی و لە تینوێتیدا مرداربۆتەوە و بەهۆیەوە چۆتە دۆزەخ.

هەر لەمناڵیەوە دایك و باوکمان و دەوروبەرمان فێریان دەکردین کە دڵنەرم و بەبەزەیی بین لەگەڵ ئاژەڵ و باڵندەو گیانەوەراندا، هەر کەسیش

---

[1] کاك (عبدالله حەمەصالح شێخ عەلی) کوڕەداوێ بۆی گێڕامەوە، ڕووداوەکەش بەسەر خۆی هاتبوو.

له مەڕو بزن و ئاژەڵە ماڵیەکانی بدایە لەناو خەڵکیدا بە بێبەزەیی و دڵڕەق دەناسرا و زۆرجار بە خراپیش باسدەکرا، هەمیشەش چاوەڕێ دەکرا توشی دەردوبەڵاو موسیبەت بێت.

منیش تا منالْ بووم چەند لای باوك و دایکی خۆم بووم، ئەوەندەو بگرە زیاتریش لە لای باپیرم و نەنکم دەمامەوە، ئەوانیش لەخواردن و میوەو شتی خۆش بێبەشیان نەدەکردم و کەمتەرخەمیان نەدەکرد، ڕۆژێکیان وەکو عادەتی خۆم بەبێ خولق و بانگێشت خۆم کرد بە ماڵی باپیرمدا، ئەوانیش چاوەڕێی خەمرەوێنیکەیەك بوون. زۆریان پێخۆش بوو، هەر لەگەڵ دەرکەوتنم دەستیان کرد بە بەخێرهاتنم و بەقوربان و بەساقەبوونم. نەنکم وتی: باش بوو هاتی بڕۆ وا مشکێك بە تەڵەکەوە بوە بیکوژە، منیش مشکەکەم هێنایە سەر سەتڵەئاوێك، هەر لە ئاوەکەم هەڵدەکێشاو نەمدەهێشت بخنکێ دەرمدەهێنایەوە، دوبارە واملێدەکردەوە، تا بەزەلیلی کوشتم.

ئینجا تا من بەحسابی خۆم ئەو چالاکیەم کرد، نەنکیشم هێلکەورۆنێکی خۆشی بۆکردم، زۆریشم برسی بوو، خێرا پاروێکم برد بۆ دەمم، هەر ئەوەندەم خۆشبوو پاروەکە گەیشتە قورگم، پاروەکە بووبە بەردو لەگەرووم گیرا نەدەردەهاتەوەو نەبۆم قوتدەچوو، زۆر رایان وەشاندم و هەڵیانتەکاندم، هیچ سوودی نەبوو، چوار پەلم سارد بوەوە، کەچاریان نەما باپیرم وتی: تازە ڕۆحی تیانەماوە، ئەو پەردەیەی پیادەو لێگەڕێ، کاتێك دەستیان لێشۆردم پاروەکە بەئاسانی ڕۆشتە خوارەوەو ڕزگارم بوو، بەڵام لەتەواوی ئەو ماوەیەدا دەمزانی و لەبەرچاوم بوو کە هەقی ئەو مشکە بێزمانە بوو وام لێهات .

# پەتی ستەم لە ئەستوریدا ئەپسێ

لە مێژە لە ناو کورددا وتراوە: هەموو شتێك لە باریکیدا دەپسێ ستەم نەبێت لە ئەستوریدا دەپچڕێت، (شێخ قادر کوڕی شێخ رسوڵی باسنێ) بۆی گێڕامەوە، وتی: پیاوێکی زۆردارو بێبەزەیی لەم دەڤەری سیوەیلەی ئێمە دەستی دابووە زوڵم و زۆر و ئازاردانی ڕەشوڕوت و غەریبەو بێکەس و نەدار، بە ناوی ئاغایەتیەوە ئەوەی خوا پێی ناخۆش بوو دەیکرد، خەڵکی فەلاقە دەکرد، خاوەن سومعەو کەسایەتی دەشکاند، سوکایەتی بە هەموو خاوەن ڕێزێك دەکرد کەملکەچی و بچوکی لە بەرامبەریدا نەنواندایە، زۆربەی ئەم ستەم و دەستدرێژیەی بەچڵکاوخۆر و داروودەستەکەی دەکرد، ئەوانیش بۆ دەستخستنی بەرماوەو ئافەرینی ئاغا ئەوەی بە خەیاڵیاندا بهاتایە دەیانکرد، چونکە کورد وتویەتی: (سەگ بە قەوەی کلکی نیسقان دەشکێنێ)، بەڕاستی خەڵکی لەترسی شەڕو فیتنەو ناپیاوی جەنابی ئاغا خۆیان کەنارگیر دەکرد، ئەگەر هەر توشیش ببونایە بەناچاری خزمەتی چاکیان دەکرد، بەڵکو لە خزمەتی خزمەتکارو ئەسپەکانیشیدا بوون.

لەو سەردەمانەی دواییدا کە ستەمەکە تەواو لەسنور دەرچووبوو، جارێکیان هاتە باسنێ لەناو دێ بە سواری ئەسپەکەیەوە ئەگەڕا، لوتی لە ئاسمان و قاچی ئەسپەکەی لە زەوی، دوو سێ پیاوی بانگکرد، وتی: ئەسپەکەم دەستی عەزیەتی گەیشتوە، بە ئاستەم هەستی پێدەکەم،

ئەوەتا بۆی دەلەنگێ، ئێستا کاتی مەڕ بەڕەڵلاکردنە، مەڕێکم بۆ بگرن و بە زیندووی دوگی ببڕن، با بە گەرمی لە دەستی ئەسپەکەی بنێم، زۆر لێی پاڕانەوە، وتیان: با مەڕەکە سەربیبڕین ئینجا دوگەکەی لێبکەینەوە، ئاغا بەداری لەعنەتدا چوو، وتی: دەبێ هەر بە زیندووی دوگی مەڕەکەم بۆ ببڕن و بەگەرمی لەشوێنی ئازاری ئەسپەکەی بگرم، یاڵلا! هەی ڕەشوڕوت! فێری دەمەدەم بوون لە گەڵمدا، هەمووتان دارکاری دەکەم، لە حەوزێتان هەڵدەکێشم، بۆیە بە ناچاری پەلاماری مەڕێکیانداو لە بەردەمی ئەسپەکەی ئاغادا بە کرچوکاڵی دوگیان داتاشی، ئاغاش لەسەر ئەسپەکەیەوە سەیری ئەکردن، ئیتر مەڕی داماو بێ زمانیان بە زەلیلی و کۆڵەواری بەڕەڵلا کرد، بە باڕە باڕو هاوار هاوار ڕای کرد بە دوای هاوڕانەکەیدا، بەڵام خۆ مردن بەدەست خۆی نیە، ئەگەر نامردن و سەربڕین زۆر ئاسانترو خۆشتر بوو لەو هەموو ئێشوئازارە، ئەم ستەمەش وەك دەیان ستەمی تر گوزەریان کردو کەس نەیوێرا ناڕەزایی دەربڕێ، مەگەر بەدڵ یان بە پەنهانی و بە نزاوپاڕانەوەو لالانەوە، سۆزو بەزەیی و پشتیوانی خۆیان بۆ ئەو مەڕە بێزمانە دەربڕی بێت.

بەڵێ وادیارە نزاز پاڕانەوەی خەڵکە میهرەبان و بە بەزەییەکە، هاوکات لەگەڵ باڕەو ناڵەو فوغانی مەڕەکە سنوری ئاسمانەکانیان تەیکردو گەیشتونەتە شوێنی مەبەست، خوا ویستی وابوو ئەو خەڵکەی توغیان و لە خۆباییبونی ئاغاو زەلیلی و داماوی مەڕەکەیان بینی ئەو دەمەی حەیسرمەیانی کردن و بە فەرمانی ئاغا بە زیندوی دوگیان لێکردەوە، هەمان خەڵك ئەوانەیان خوا تەمەنی دابوو، بە چاوی خۆیان ئاغایان بینی

لەهەمان گوند کە جاجمی[1] ڕاخستبوو، سواڵی گەنم و جۆو دانەوێڵەو بژێوی ژیانی دەکرد، پیتاکیان بۆ دەکرد بۆ ئەوەی خۆی و خێزان و مناڵەکانی لەبرسا نەمرن.

هەر لەو گوندەو لەو سەرکۆڵانەی فەرمانی دەرکرد دوگی مەڕەکە بە زیندووی و بە کاڵی داتاشن، هەر لەوێ بە چاوی خۆم بینیم جاجمی ڕاخستبوو پیتاکیان بۆ کۆدەکردەوە، بە هەر چوار لادا ئەیڕوانی، ئاخۆ کێ لەوێچێ گەنم یان جۆ یان هەر دانەوێڵەیەکی بۆ دێنێ، بەهەرحاڵ ڕیشسپیەکانمان زۆر بەڕەحم و میهرەبان بون، داوایان لەخەڵکی دەکرد کەیارمەتی بدەن، ئەوان دەیانوت: فلان زوڵمی کرد بۆیە ئاوای بەسەرهات بائێمەش بەدەردی وی نەچین، خزمینە! قەیناکا خۆی شایستەی بەزەیی نیە، بەلام با دەست لەقوڕقوڕاگەی ژنومناڵەکەی نەنێین، خەڵکی وردەوردە دانەوێڵەو خۆراکی وشکەو توێشەبەرەیان بۆ کۆکردەوە، بەشی ئەوەندەی ئەو زستانە لەخەم بڕەخسێن و لەبرسا نەمرن و هیچی تر. زاڵمی لەپێکەوتوش بەدیار جاجمەکەوە ملی شۆڕکردبو، هیچ دەسەلات و زەبرو زەنگی نەمابوو[2].

[1] پێخەفێکە لە خوری دەچنرێ. نوسەر

[2] مەبەستمان نەبوو ناوەکان و شوێنەکان بە وردی بنوسین، تەنها مەبەستمان پەند وەرگرتن بوو، ئەگەر نا هەمو وردەکاری بەسەرهاتەکەمان دەزانی.

# ئەم جارە دوو کچی چاو گەش قۆچی قوربانین

سەردەمێك کەسوپاو قەرەوڵەکانی فیرعەون و نەمردودو سەدامەکان ڕوویان دەکردە هەر باخچەو گوڵستانێکی ئەم دونیایە، گوڵ و گوڵزارو دڕك و داڵیان بەیەکەوە دەسوتاندو جیاوازیان نەدەکرد لە نێوان چەکدارو منداڵی شیرەخۆرەو دۆست و دوژمن.

نەمرود هەقبێژو بێتاوانەکانی بە ئاگر ئەسوتاند، و فیرعەون فەرمانی دەردەکرد نابێ کەس کوڕی ببێت، و ئەگەر کەسێکیش کوڕی ببوایە منداڵە ساواکەی سەردەبڕاو دایك و باوکیشی دوچاری غەرامەو سزاو ئەشکەنجە دەبون، بەڵام سەدامی گۆشکراوی دەستی بەعسی سۆشیالیستی زۆر لە کوڕو کچ، منداڵ و پیر، دۆست و دوژمن، چەکدارو بێچەك، تاوانبارو بێتاوانی لەناوبرد، تەنانەت دەستی لە خزمەتکارو وەزیرو بەردەستەو خزمەکانی خۆشی نەدەپاراست، ئەو کەسەی لەبەرەکانی جەنگ نەکوژرایەو لەهێرش و شاڵاوو پەلاماری دوژمنیش ڕزگاری بوایە، ئەوا لە کەڵبەی بەعسیەکان ڕزگاری نەدەبوو، لە سەر هەموو ڕێگاکان چەکدارو جەللادو پیاوکوژی دانا بوو، هەرکەس لە جەنگ ڕزگاری بوایە ئەمانە پێشوازیان لێدەکرد، بەڵام نەك بەدەستخۆشی و بەخێرهاتن و پێشکەشکردنی ئاوی ساردو خواردنی خۆش بۆی، بەڵکو خێرا بە بێ چاوبەستن و دەستبەستن دەیانکوشت و لە تەرمەکەیان دەنوسی "جبان"، واتە: ترسنۆك.

لە کاتی دادگاییکردنی سەددامدا کەسێك بانگکرا بۆلای حاکم و داوای لێکرا قسە بکات، وتی: من لە پێشەوەی بەرەکانی جەنگ بووم، دوای

جەنگێکی ترسناك و سامناك بە دیل گیرام لەلایەن ئێرانەوە، دوای چەند ساڵ ڕزگاربوونم لەدیلی بەدڵێکی خۆشەوە گەڕامەوە بۆ ناو ماڵ ومناڵم، هاوسەرە کەساس و مناڵە چاوگەشەکانم دەهێنانە بەرچاوم کەچۆن دڵیان خۆشدەکەم و مناڵەکانم چەند گەورە بوون، دەیان خەیاڵ و خەتەری تر، ئەو چەند ڕۆژەی لەبەندینخانە ڕزگارم بوو هەتا گەیشتمە ماڵەوە دەیان جار بە داڵغە مناڵەکانم ماچدەکردو لە باوەشم دەکردن و لەسەر باوەشم دامدەنان .

بەڵام کەگەیشتمە ماڵەوە.!

یاخوا دوژمنیشم بەو شێوەیە نەگەڕێتەوە ناو ماڵی خۆی، خۆ مردن بە دەستی خۆم نەبوو ئەگەر نا ئەوە قسەیەکی ترم دەبوو، کەیەکەم هەنگاوم نایە ناو ماڵەکەم، بەسەر هەواری خاڵیدا کەوتم، ماڵی شڵەژاوو کەلوپەلی تەپوتۆزاوی، دەتگوت بایەقوژ بە سەریدا خوێندوویەتی، دەرودراوسێ داباریین بەسەرمدا، دەستیانکرد بەسەرەخۆشی و دڵدانەوەم، وتم: چی بووە؟ یەکێکیان هاتە پەنامەوەو سەیرێکی ئەملاو ئەولای کردو بەدەنگێکی بزڕکاوو نیوە گریان وتی: ژن و مناڵەکەت کەوتنەبەر شاڵاوی ئەنفال، ئەو خەفەتەی چوو بە جەرگمدا ژانی لەدەیان مردن ناخۆشتر بوو، هەرچی ناخۆشی جەنگ و شەڕو چەند ساڵ دیلیم لەبیرچووەوە.

بەڵێ ئەرزو حاڵێکی داواکاری بینینی (سەددام)م نوسی، و لەڕێگەی ڕەسمیەوە داوامکرد، بەهەزار تەنگ و چەڵەمە هەتا گەیشتمە لای سەددام کوێرە ئومێدێکم مابوو، کە ئەم سەددامە ئەگەر دڵی وەکو بەردو پۆڵاش بێت بەزەییەکی پێمدا دێتەوە، بەڵام دوای خوێندنەوەی داواکاریەکەم،

وتی: خێزان و منداڵەکانت بەر شاڵاوی ئەنفال کەوتوون، دەستمکرد بە تکاو ڕجا، قسەکەی پێ بڕیم و وتی: بێدەنگ نەبی خۆشت دەبەم بۆلای ئەوان. کاتێك بەهەناسەی سارد و دڵی غەمگین و قوڕگی پڕ گریان ئەمەی گێڕایەوە، ڕوویکردە ئەو قەفەزەی سەددامی تێدا ڕاگیرابوو، وتی: دەی ئەو قەفەزەت پیرۆزبێت!

منداڵ و گەورە، ژن و پیاو، کەسوکاری چاوەڕێی تەرمەکەیان دەکرد، بەڵکو زۆر زۆر مەمنونیش دەبون کە تەرمەکەیان بدەنەوە، لەوەش زیاتر ئەفسەرو ئاسایشەکانی دەوڵەت نرخی فیشەکەکان و هەقدەستی کوشتنەکەشیان لە خاوەنی کوژراوەکە دەسەند بەزۆر، بەو شێوەیەش خاوەن تەرمەکە زۆر مەمنونیان دەبوو کە تەرمەکەیان داوەتەوە.

لەو سەردەمەدا[1] لە دۆڵی جافایەتی دەڤەری پشدەر سوپای عێراق هێرش دەکاتە سەر گوندی یاخیان و پیاوێك دەستگیر دەکەن بەناوی پیرۆت و بەشێوەیەکی ترسناك ڕاپێچی دەکەن، هەروکو دەستی بەخوێنی باوکیان سوربوو بێت، کەسیش نەیدەوێرا تکاو ڕجای بۆ بکات، ئەگەر نا ئەوە خۆشی بەدەردی ئەو دەچوو، بەڵێ پیرۆتیان برد، هەموو خەڵکی گوندەکەش خەفەتبارو دڵتەنگ بوون، هەر وەکو کوڕو جگەر گۆشەی خۆیان گیرابێت، بەڵام هیچ دەسەڵاتیان نەبوو.

[1] لە ساڵی (١٩٨٨)، ئەم چیرۆکە لە دەمی کاك محمودی هەڵەدنی وەرگیراوە بەدەستکاریەوە دواتریش خۆم قسەم لەگەڵ کاك پیرۆتیش کرد و لەدەمی خۆی وەرمگرت. نوسەر

بەڵێ سوپای تاوانبارو خراپەکارو ستەمکار پیرۆتی بێتاوان و هەناسەساردیان ڕاپێچ کرد، و لەو لەشکرو قەرەوڵانەدا تروسکەی سۆزو بەزەییت بەدی نەدەکرد.

بەڵام یەك گەردیلە دڵسۆزی بەهێزترە لە هەموو خزم و عەشیرەت و کەسوکار، بەهێزتریشە لەهەموو جەیش و جاسوس و سوپای گورز بەدەست و زەبروەشێن و خاوەن تۆپ و تەیارە. کاتێك هۆردوی لەشکرەکە بەلای گوندی دۆڵەبیدا تێدەپەڕێت، خوشکێکی پیرۆت چاوی بە پیرۆتی برای دەکەوێت بەدەست چەکدارەکانی بەعسەوە پەرووباڵی کراوەو دەستبەستراوو دەست بەسەرە، خورپە بە دڵی دەکەوێت، مەگەر هەر فریای ئەوە بکەوێت لە دڵی خۆیدا بە پەنهانی بڵێ: سوپاس بۆخوا دیار ئاخیرەتی پیرۆتی برام نەبووم. بەڵام خۆی نائومێدنەبوو ویستی پیرۆتی براشی نائومێد نەبێ و دڵسۆزی و خۆشەویستی خۆشی بۆ براکەی بسەلمێنێت، بۆیە تەنها فریای ئەوەندە کەوت هەتا توانی هەردوو دەستی بەرزکردەوەو لەناخی دڵیەوە وتی: خوایە هەدوو کچەکەم بەقوربانی پیرۆتی برام بن، پیرۆت بەسەلامەتی بگەڕێتەوەو هیچی لێ نەیەت، ئیتر بەعسی دڵڕەق و خوێنمژ پیرۆتیان ڕاپێچ کرد، خوشکیشی هەردوو کچەکەی خۆی کرد بە خێرو فیدای پیرۆتی برای، وەکو بە کوردی دەڵێن: بەڕاستی قسەو هەڵوێستی ئاوا جەرگی دەوێ.

بەڵێ ڕۆژان هاتن و ڕۆژان ڕۆیشتن، پیرۆت هیچ هەواڵێکی نەبوو نە بەمان نە بە نەمان، خەڵکی ئاوایش بەگشتی و بە تایبەتیش کەسوکاری پیرۆت زۆر مات و غەمبارو دڵتەنگ بوون.

ڕۆژێك لە ناكاو لەخوار ئاواییەوە تارماییەك دەركەوت، یەكێك وتی: كوڕینە ئەوە دەڵێی پیرۆتە، ئەوانی تر وتیان: بابە پیرۆتی چی؟ برینمان مەكولێنەوە، بەنزیكبوونەوەی تارماییەكە وردەوردە خەڵكەكە ڕەئیان گۆڕاو، یەكێك دەیووت: بەخوا بەڕۆشتنەكەی بێت ڕاستەدەكەی پیرۆتە، ئەوی تر دەیگوت: بەخوای شانوشەوكەتیشی هەر لە پیرۆتی دەچێ، ئیتر وردە وردە بەچاو تارماییەكەیان بەخێوكرد، كەنزیك بوەوە پیرۆت بوو، خەڵكی ڕایان كرد بەرەو پیری، دوای بەخێرهاتن و خۆشحاڵی دەربڕین وتیان: ئەرێ پیرۆت چۆن ڕزگارت بوو؟ وتی: نازانم، هەر ئەوەندە دەزانم ناویان خوێندمەوە، ئەوەی خەیاڵم بۆی نەدەچوو ئازادبوون بوو، وتیان: بڕۆ خۆ هیچت لەسەر نیە.

دوو سێ ڕۆژ بوو پیرۆت ئازادبوو بوو، كچێكی خوشكەكەی لەو دووكچەی كردنیە قوربانی پیرۆتی برای، ئاوی دەگێڕا بۆ پیرۆت و میوانەكانی، دوای ئاوگێڕانەكە بەبێ نەخۆشی یەكسەر مرد، پرسەی ئەمیان تەواوبوو، دوای نزیكەی پێنج ڕۆژ كچەكەی تریشی لەسەر ساخی مرد.

لە مێژووی عەرەبدا هاتووە كە خەنسا (٢٣ ساڵ) بۆ صەخری برا بچوكی گریاوە، بەڕاستی فیداكاریەكەی خوشكی پیرۆتیش لە دڵسۆزیەكەی خەنسا كەمتر نەبوو، بەڵكو گرنگترو سەرنجڕاكێشترە.

# تەنها کارێك دڵم پێی خۆش بێت لەبەر خوا کردومە

زۆر جار هاورێی چاك تام و چێژی خزمی چاکی هەیە، بگرە لەزۆر خزم و برای پشت و خوێن وگۆشتیش فریادڕەسترو دەست گەرمترە، تەنانەت هەندێ جار خۆیان لەسەریەك بەکوشتداوەو شەڕو دوژمنایەتیان لەسەریەك کردوە، وابوە یەکێکیان زوتر مردووە، ئەوی تر وەسیەتی کردوە لە تەنیشت گۆڕەکەی ئەودا ئەسپەردەی خاکی بکەن، وتویەتی حەز دەکەم لە گۆڕستانیش دراوسێی ئەو بم، ئیشوکاریان بۆ یەکتر کردەوە و کارو پیشەی یەکتریان ڕاپەڕاندوە.

ئەوەتا هەموومان بیستومانە کە هاوەڵانی پشتیوان (الأنصار) کاتێك هاوەڵانی کۆچبەر (المهاجرين) لە مەککە ئاوارەکران و هاتنە مەدینە لەلای هاوڕێ مەدینەییەکانیان حەوانەوە، مەدینەییەکان پێشنیاری ئەوەیان کرد کە لە دوو ژنەکەی کامیانی بەدڵە بۆی تەڵاق بدات، و لە دووباخەکەی کامیانی بەدڵە پێشکەشی بێت، لە خانوەکەشدا با برا ئاوارەکەی لەقاتی سەرەوە بێت و پاروە خۆشەکەشیی ئەدا بەو برایایەی کە بە ئاوارەیی پەنای بۆ هێناوە، هەرچەندە خۆی هەژارو نەداریش بوایە لە پێشدا برا مەککەییەکەی تێردەکردو پێویستیەکەی ئەوی چارەسەر دەکرد، پۆشاکە جوانەکەی و پێڵاوە تازەکەی و پێخەفە نوێکەی و خواردنە خۆشەکەی ئەدا بە هاوڕێ ئاوارەکەی، لە کاتێکدا کە لە دەستی براو خزم و کەسوکاریان ڕایان کردبوو ئەوان ئاوارەیان کردبون!

به هەرحاڵ ئەم بابەتە زۆر بەرفراوان و گرنگەو ئەم هەویرەش ئاوی زۆر دەکێشێ، بۆیە لێیدەگەڕێین و دەچینە سەر ڕوداوێکی واقیعی و ڕاست و دروست لە دۆڵی جافایەتی و لە گوندی هەڵەدن، بوو پیاو لەم گوندە بەناوی قادر هەڵەدنی و سوارەی هۆمەری زۆر هاوڕیەتییان خۆشبوو، بە بێ یەکتر ڕێیان لەبەر نەدەچوو، بە کوردی خۆمان دەڵێن هەر ناموسمان بەین بوو، زۆر جاریش بەیەکەوە دەچونە ڕاو.

ڕۆژێکیان شەیتان بە گژ یەکیاندا دەکات و ئاگری شەڕ لە نێوانیاندا دادەگیرسێنێ و بە یەکدا دێن و لەو شاخ و چیاچۆڵە کەس نابێ دەستیان بگرێ و لێکیان جیا بکاتەوەو ناوبژیەکیان بکات، تا لە کۆتاییدا سوارە (قادری) هاوڕێی گیانی بە گیانی خۆی لە چیایەکی سەختوسەرکەشی پشتی گوندی چاڵاو دەکوژێ، هەر ئەوەندەی دەنگی تەقە بیسترا، خەڵکی لە هەموو لایەکەوە لە پێدەشت و بناری چیاوە پیایهەڵگەڕان، بزانن ئەم تەقەیە چی بوو؟

کاتێ چوون بینیان قادر کوژراوە، کەسیش خەیاڵی بۆ سوارەی هۆمەری نەدەچوو کاری وای کردبێت، بە هەر حاڵ کۆمەڵێك تەرمەکەیان هێنایەوە، کۆمەڵێکیش بەدوای بکوژەکەدا دەگەڕان، ئاگاداریش بون کە بەیانی لەگەڵ سوارەی هاوڕێی گیانی بەگیانی بەیەکەوە ڕۆشتونەتە ڕاوێ. بۆیە هەوڵیان بۆ ئەوە بوو سوارە بدۆزنەوە، هەر نەبێ بزانن ئەگەر خۆشی قادری نەکوشتوە سۆراخێکی بکوژی قادرمان بۆ بکات.

لە دوای گەڕان و ئەمسەرو ئەوسەرێکی زۆر لە ئەشکەوتێکدا سوارەیان دۆزیەوە لێی چونە بەر تفەنگێ، وتیان: پێمان بڵێ کێ قادری کوشت؟ بۆ

هێشتت بیکوژن؟ سوارەش هەر دەستبەجێ دانی بە تاوانەکەیدا ناو پەشیمانی دەربڕی، هەندێکیان هەر لەوێ ویستیان بیکوژنەوە، بەڵام ئەوانی تر وتیان: بە خودای باوکی قادر تکاو ڕجای لێکردوین و داوای کردوە کە بکوژی قادر بەدەستی بەستراو بەرینە بەر دەستی خۆی، ئاوقای دەست و قاچمان بووە کەبکوژەکەی بە زیندویی بۆ بەرین و نەیکوژین. هەر چۆنێ بوو ڕازی بوون، وتیان: دەی باوکی قادر دەیەوێ تاوانبارەکە لەبەر چاوی خەڵکی بکوژێتەوەو خەڵکی پێ تەمێخوارد بکات و سوکنایی دڵیشی بەوە بێنێت.

جا هەر کەهەواڵی دەستگیرکردنی بکوژی قادر بڵاوبۆوە، مقۆمقۆی ئەوە دەستی پێکرد کە سوارەی هۆمەری (قادری) هاوڕێ و خۆشەویستی گیانی بە گیانی خۆی کوشتوە، هەموو خەڵکی ناوچەکەو بە تایبەتی خەڵکی هەر دوو گوندی هەڵەدن و سەرگەڵوو سەریان سوڕماو واقیان وڕما، چۆن سوارە دەستی چۆتە قادری هاوڕێی؟ هەموو خەڵکی بەیەکدەنگ دەیان وت: بیکوژنەوە، نەیەڵن لەدوای قادر یەك ڕۆژ بژی، بیکوژن ئەو ناپیاوی ناپاکە، بیکوژن نەیەڵن دەرچێ .

بەڵام باوکی (قادر) بەناو خەڵکیدا شاڵاوی هێناو خەڵکەکەی بڕداو هاتە پێشەوە، وتی: من خاوەنی هەقم من خاوەنی خوێنم کەس سوارە نەکوژێت لەسەر کوڕی من، بیدەنە دەست خۆم، هەر چۆنێك بێت هەتا ئێوارە خەڵکی ئاوایی بەتایبەتی خزم و کەسوکارو خاوەنخوێن چاوەڕێ بڕیاری باوکی قادر بوون بۆ کوشتنەوەی سوارە، ئێوارە نان و چێشت دانرا، کۆمەڵێ چاو سوریش حەرەسی سوارە بوون نەوەك دەرفەت بێنێت

و ڕابکات، هەموو هاتنە سەر سفرەو پەلاماری نانوچێشتیاندا، بەڵام سوارە دۆش دامابوو، زۆر خەفەتبارو دڵتەنگ بوو، نەك خواردن و چێشت لە ترساندا ئاویشی بۆ قوت نەدەچوو.

ئینجا هەڵویستی مەردانەو موسڵمانانەی باوکی قادری جوانەمەرگ وەك مانگی چواردە کۆڕو مەجلیسەکەو دڵی سوارەی ڕووناککردەوە، خێرا دەستی سوارەی گرت و فەرمووی کرد بۆ سەر سفرەو خوانەکەو وتی: وەرە پێشەوە فەرموو، وەرە پێشەوە مەترسەو خەفەت مەخۆ، من باوکی قادرم، من خاوەنی خوێنم تێر بخۆو خەمت نەبێ، بە خوا لەبەر خاتری خوا نایەڵم کەس دەستت بۆبەرێ و خوێن لە لوتت بێنێت، لێتخۆش دەبم، دەی توخوا وەرە لە تەنیشت خۆمەوە بەبێ ترس و لەرز خواردنەکەت بخۆ، بامنیش ئەوەندەم بۆ خوا هەبێت، لەلایەن خزمانەوە زۆر گلەیی و گازندەی لێکرا، بەڵام گوێی نەدایەو نەیهێنایە سەر خۆی و سوور بوو لەسەر قسەکەی.

ئیتر سوارە وەکو گوڵ گەشایەوە، دەستیکرد بە نانخواردن و دوای دووشەو تەسلیمی کەسوکاری کردەوە، وناردیەوە بۆ سەرگەڵوو لەبەر خوا لێی خۆش بوو، چونکە دەیزانی ئەوە لە ڕق و پیلاندانانەوە نەبووە وشەیتان فریویداوەو ئەو گوناهەی پێکردووە، بە کوشتنی سوارەش کوڕەکەی ئەو زیندوو نابێتەوە

# کێ بەدەنگ هەتیوەکانەوە هات؟

لە ساڵی ١٩٨٧ لە دەست جەندرمەکانی حیزبی بەعس ماڵەوماڵ و کوناوکون خۆم دەشاردەوە، چونکە فیرارو مارانگاز بووم[١]. مردنم بە ئاوات دەخواست، نەوەك جارێکی تر زەلیل وزەبونی ژێر ئەشکەنجە و لێدانی دەستی بەعسیەکان ببمەوە، زۆر جار باوکم (بە رەحمەت بێت) پیاوێکی دوورە خزمی خۆمانی بەناوی (حاجی حەمەڕەزا) لە گەڵ خۆی دەهێنایەوە بۆ ماڵەوە، پیاوێکی زۆر بەتەمەن و قسەخۆش و خواناس و زەین ڕوون بوو، هەرچی خوا دابووی بەیەکەوەو سێقۆڵی دەمانخوارد، دواتر دەکەوتمە پرسیارکردن لە حاجی حەمە ڕەزای دونیا دیدە، ئەویش هێواش هێواش و بەکاوەخۆ وەڵامی ئەدامەوە.

لە یەکێك لە بەسەرهاتە سەیرو سەمەرەکانیدا دەیفەرموو: لەسەردەمی گرانی و نەبونی (گرانی گەورەدا) چەندەها پیاوی گەورە وبەشانوشەوکەتم دەبینی لە برسا دەمردن، یەکێك لەو پیاوانەی کە مرد، مردنەکەشی بوە هۆی خەفەت ودڵتەنگی وپەژارە بۆ هەموو خەڵکی گوندەکەمان (گوندی کوڕەداوێی شاربازێڕ)، پیاوێك بوو لە دوای مردنی خۆی پێنج هەتیوی بەجێهێشت، ئێمەش خۆمان هەموو برسی وڕەشوڕووت، هەرکەسیش دەمرد دەمان وت: بە ڕەحمەت بێ ڕزگاری بوو، بەڵام ئەم پیاوە لەبەر خۆی نەبوو کە بەداخ بووین، بەڵکو لە بەر ئەو پێنج هەتیوە ڕەشوڕووت و داماوە بوو کە دامانتابوو لەبەرچاوماندا لەبرسا

[١] پێشتر لە ساڵی (١٩٨٢) بە (١٥) پانزەساڵ زیندانی حوکم درابووم.

دەمرن وئێمەش هیچمان لە دەست نایەت وخواش غەزەبمان لێدەگرێت، بەهەرحاڵ لەبەر برسیەتی ونەبوونی کەس توانای گۆڕهەڵکەندنی نەبوو، هەرچۆنێك بوو دووسێ بست گۆڕەکەمان بۆ قووڵکرد، هەر ئەوەندەی سەگ ودڕندە تەرمەکەی ڕانەکێشنە دەرەوە، ئیتر ئەوە ئەوپەڕی تواناکمان بوو کە ئەو گۆڕە سادەمان بۆخۆی هەڵکەند، ئەوەندەی لە تواناشماندا بوو بۆ مناڵە هەتیوەکانی گریاین، وەکو دەڵێن: تا کەڤاوەسك بووین و فرمێسکمان لێبڕا، جا فەرمووی: لەو گرانیە تەنها لەیەك شەوو ڕۆژدا سیانزە پیاوی گەورەم بژارد کە لە برسا مردبوون، تەرمەکانیشیان لە شوێنی خۆیان کەوتبوون کەس توانای ئەسپەردەکردنیانی نەبوو.

بەهەر حاڵ بەدەم گریانەوە لە گۆڕستان گەڕاینەوە، هەر هەمان شەو لە خەومدا لە ماڵی ئەو پیاوە مردووەی پێنج هەتیوەکەی بە جێهێشتبوو ڕووناکیەك دیاربوو دەروژوری دەکرد، خێرا خۆم گەیاندە لای، کە بە پەیژەدا چومە سەرەوە بینیم پیاوێکی زۆر نوورانی وجوان لە ماڵەکەدا هەڵدەسوڕا، وئەو ڕوناکیەش هەر تیشك و نووری ئەوبوو هیچ چراو ئاگری لێنەبوو، خێرا سەلامم لێکرد ووتم: جەنابت کێی؟ فەرموی: من پێغەمبەری خوام (ﷺ)، وتم: بۆچی تەشریفت هێناوە بۆ ئێرە؟ فەرموی: هاتوم بۆ سەرپەرشتی ئەو هەتیوانە، بۆ ئێوە واتان دەزانی کەس نیە سەرپەرشتیان بکات؟!

ئینجا وتی: دەیان پیاوو ژن و مناڵم بینی لە برسا مردن، بەڵام ئەو پێنج هەتیوە ڕزگاریان بوو لە گرانی وکەسیان نەمرد.

# ئاژەڵ و باڵندەکانیش بەرامبەر هەتیو میهرەبانن

لێژنەداری سوتاندنمان هەڵچنیبو لەسەر یەك بۆ ڕۆیای زستان، ئەوەش پیشەی هەموو ساڵێکمان بوو، لەترسی سەرماو کڕێوەی زستان، ڕۆژێکیان بەلای لێژنەدارەکاندا ڕۆیشتم، گوێم لە نوزەی بێچوە پشیلەیەکی بچوك بوو، زۆر بەزەلیلی و داماوی دەیمیاواند، منیش ڕەحمم بۆی جولاو خێرا بانگی ئیسماعیلی کوڕم کرد کە دارەکانمان لابرد، سەیرمان کرد چوار بەچکە پشیلەیان لە ژێردا بوو، سیانیان مردار بوونەوەو، تەنها یەکێکیان زیندوو بوو، ئەویش ئەوەندە بچوك و لاواز و ڕوتەڵەو زەبون بوو بوو، یەکێك بیوتایە دەژی سەد دەیانگوت ناژی، بە هەرحاڵ کاکە ئیسماعیلی دڵ پڕ لە سۆزو بەزەیی (لە بابی کەوێ)، خێرا رایکرد لای دایکی شیری مانگای بۆ هێناو بە دەمیدا کرد، لەگەڵ خواردنەوەی شیرەکە بەچکە پشیلەکە ئاهێکی بەبەردا هاتەوەو بێدەنگ بوو.

ئێمەش چەند ساڵ بوو مریشکێکمان هەبوو، یەك هێلکەیان ژێرنایەو بیست هێلکەیان ژێرنایە هەر یەك جوجەڵەی هەڵدەهێناو ئەوانی تری پیس دەکردو جێی دەهێشتن، لەو کاتەدا مریشکەکە بە خۆی و جوجکە تاقانەکەیەوە هات و هەر ئەوەندەی دەنگی بەچکە پشیلەی بیست، خێرا لێی نزیك بوەوەو بۆنی پێوەکرد، ئیتر ئەو شەوە دڵی بڕوای نەهات بە جێیبێڵێت، بە خۆی و جوجکەکەیەوە لەلای بەچکە پشیلەکە مانەوە، جوجەڵەکەی خۆی خستە ژێر باڵێکی و بەچکە پشیلەکەشی خستە ژێر باڵەکەی تریەوە! ئیتر چۆنتان بۆ دەگێڕمەوە ئاوا، ئەو مریشکە بەچکە

پشیلەکەی لە خۆگرت و دەستی لێ بەرنەدا، جوجەڵەکە لە ژێر باڵێکیەوە سەری دەردەهێناو بەچکە پشیلەکەش لە ژێر باڵەکەی ترەوە سەری دەردەهێنا، بەڕۆژ کاکە ئیسماعیلی چاکەخوازو بەبەزەیی شیری مانگای ئەدایە، بە شەویش مریشکەکە ژێر باڵی خۆی ئەدا، زۆرجار بەڕۆژیش هەر لەگەڵ خۆی دەیگێڕا، تا بەچکە پشیلەکەی گەورە کردو لەخەم ڕەخسی.

ئینجا بەچکە پشیلەش بەگەورەیی بێوەفاو نمەك کوێر نەبوو، هەر لەدەوروبەرو نزیکی ئەو مریشکە دەخەوت و هەڵدەسوڕا، تەنانەت ئەگەر مریشکەکە لەسەر هێلکەکانی دەکەوت، پشیلەکە بە جێی نەدەهێشت، لەو کاتانەشدا کە مریشکەکە بڕۆیشتایە بۆ ئاوخواردنەوەو ملۆمۆچ و خواردن پشیلەکە بەدیار هێلکەکانیەوە هەڵدەتروشکاو حەرەسیات و نیگابانی هێلکەکانی بۆ دەکرد، کەس نەیدەوێرا نزیك هێلکەکانی بکەوێت پشیلەکە شالاوی بۆ دەبردو دوری دەخستنەوە[1].

زۆرجار ئەم بەسەرهاتە سەیروسەمەرانە لە وتارو کۆڕو مەجلیسدا دەگێڕینەوە، دەڵێن مامۆستایەك لەوتارێکدا باسی وەفاداری و بێوەفایی کردبوو، لەناو قسەکانیدا وتبوی: با دایکان شیری خۆیان بدەن بە منداڵەکانیان، ئەم شیرەوشکە خوا دەیزانێ چیەو چۆنە، زۆر کەسیش دەڵێن شیری سەگ و بەرازە، پیاوێکی بە تەمەن کەدیارە کوڕو کچەکانی بێوەفابوون بەرامبەری، دەڵێ: مامۆستا بە خوا لەوانەیە هەر شیری بەرازبێت و مالی سەگی پێوە نەبێت، ئەگەر شیری سەگی تێدابوایە منداڵەکانمان تۆزێ وەفایان دەبوو.

---

[1] لە زمانی حاجی صالح هەڵەدینەوە .

(حاجی کریم) خەڵکی گوندی چاڵاوا دەڵێ: جوتم دەکرد پەلەم بوو هەتا هێڵێك زیاتر جوت بکەم و بە هیچ جۆرێك خۆم نەدەخافڵاندو حەزم نەدەکرد دەست لە دەستەدووی هەوجاڕەکە بەربدەم، بەڵام لەوکاتەدا پەپوسلێمانکەیەك بەسەر هەپەی مژانەکەوە دەنیشتەوەو بە دەنوك لە هەپەکەی ئەداو تەقە تەقی لێدەکرد، و بە بەرچاومەوە هەڵدەفریە سەر دارێکی بەرز لە قەراغی زەویەکە، پەپوسلێمانکەی خەمخۆرو میهرەبان چەندجار ئەم کارەی دووبارە کردەوە، هەتا کاری تێکردم لە زمانحاڵی تێگەیشتم کە دەڵێ جوتەکەت ڕاگرە کارێکی خێرترو چاکتر هەیە، فریاکەوە، بەڵێ دوای ئەوەی تا چەند هێڵێکم جوت کرد چەندجار ئەم دیمەنەم لەم پەپوسلێمانە بینی، پێم گوناه و تاوان بوو بە دەمیەوە نەچم و هەڵوێستم نەبێت، بۆیە خوا نایە دڵم جوتەکەم ڕاگرت و چووم بە هانای پەپوسلێمانەکەوە، کە چوومە بن دارە گەورەکە سەرم بەرز کردەوە بۆئەو شوێنەی پەپوسلێمانکەکەی لێ نیشتبوەوە، بینیم مارێکی گەورە هێرش بۆ هێلانە چۆلەکەیەك دەبات کەوا دیار بوو دایکیان نەمابوو، خۆ ئەگەر ئەو جارە نەچومایە هەموو زەڕنەقوتە داماوو بێدەسەلاتەکانی دەخوارد، منیش خێرا وەکو پەپوسلێمانکەکە مەردانە بە نەقیزەو دارو بەرد تێی بەربووم، مارەکەم کوشت پەپوسلێمانکەکەش زۆر کەیفخۆش بوو، ئەمبەرو ئەوبەری دارەکەی کرد تا لەکوشتنی مارەکە بومەوە، کە زانی کوشتم و سەرم پان کردەوە هەڵفڕی و ڕۆیشت، منیش لەو دڵخۆشتر بوم، ئیتر هاتمەوە بەلای جوتەکەمەوە.

خودای گەورەش ڕاست دەفەرموێت: ﴿**وما من دابة في الأرض ولا طائر يطير بجناحيه إلا أمم أمثالكم**﴾، واتە: هیچ گیاندارێك یان پەلەوەرێك نیە کە بە باڵ بفڕێت و وەك ئێوە ئەوانیش نەتەوە و میللەت نەبن .

## ئاژەڵیش هەست و سۆزی هەیە

دوای ئەوەی حکومەتی عێراق فەرمانی دەرکرد بە چۆڵکردنی گوندەکانی سەرسنور بە قوڵی دەکیلۆمەتر بۆ ناو خاکی عێراق، یەکێك لەو گوندانەی بەر شاڵاوی ڕاگواستن و وێرانکردن کەوتن گوندەکەی ئێمە بوو، ماوەیەکیان بۆ دیاریکردین بۆ چۆڵکردن و گواستنەوەی ئەو کەلوپەل و شتانەی بە کەڵکی گواستنەوە دێن، ئێمەش بە دڵی شکاوو چاوی پڕ لە فرمێسکەوە بە ناچاری دەستمانکرد بە ڕاگواستنی کەلوپەل و ناوماڵ و زەخیرەو وشکەو ئاژەڵ و ئەو بەروبومەی بەرهەممان هێنابوو. هەندێك لەو شتانەش کەناچار بوین بە جێیان بهێڵین بەجێمانهێشتن.

جا یەکێك لەو شتانەی بە جێمهێشت و خۆشم بە گوناهبارو بێوەفا دەزانی لە ئاستیدا _بەڵام چارم نەبوو_ گوێدرێژە ڕەنجبەرو بارکێشو ماندونەناسەکەم بوو، چونکە لەناوچەی ئێمەدا ئەو کات کە سەیارە کەم بوو ڕێگەو بانیش خۆش نەکرابوو، ولاخ گەورەترین خزمەتی پێدەکراو ڕەنجی دەکێشا، بە جوتپێکردن و بارکێشی و سواری و گێرەو کێشەو کاروان و گەرمیان و کوێستان زۆر شتی تریش.

بە هەرحاڵ با بچینە سەرباسی گوێدرێژەکە، گوندەکەمان چۆڵکرد، کەم سێبەری درەخت و سەرکانی و کارێزو سەرجۆگەو لوتکەشاخ هەیە بەدەم خواحافیزیەوە تێر لێی نەگریابم و بە فرمێسك ئاورشێنم نەکرد بێت، نەك هەر من، تەواوی خەڵکی ناوچەکە بە زۆرو دەستدرێژی و ستەم لەناوچە فێنك و سەرکانی و کارێزەزولاڵ و ئاوو هەوا ساف و بێگەردو جۆگەو جۆبار وباخ و باخچە پڕدارو درەختە بەهەشت ئاسایە دەرکراین، هەر کە ناوی زۆری تێدا بوو بە دەستدرێژی و ستەممان دەزانی و هیچ دەسەڵاتیشمان نەبوو، لەناو ئەو ئاوو هەواو گوڵ و گوڵستان و دارستان و میوەو بەروبومە سازگارو دیمەنە قەشەنگانەوە بەرەو کۆمەڵگای زۆرە ملێ ئاراستەکراین، کە گەرم و پڕ لە خۆڵ و تەپوتۆز بوو، مێش و مەگەزو مێشولەو جەیش و جاش و بێ کاریش لەولاوە بوەستێ.

بە هەرحاڵ ئەوەی بە بێوەفاییم دەزانی، نەمککوێری بوو بەلامەوەو هیچ دەسەڵاتیشم نەبوو، بەجێهێشتنی گوێدرێژە هەناسەساردو نەحەساوەکەم بوو، ئەو گوێدرێژەی ئەرکی تەواوی ئەو ماڵە لەسەرشان و پشتی ئەو بوو، چوار وەرزەش پشوودانی نەبوو، ئەوەندەی خزمەت کردبوین وای دەزانی بۆ هەر کون و قوژبنێکی ئەم دونیایە بڕۆین لەگەڵ خۆمان دەیبەن و لە یادی ناکەین، بەڵام بە داخ و کەسەرێکی زۆرەوە بە جێمهێشت.

دوای ماوەیەك کە لەبیرم نەماوە چەندی پێچوو، گەڕامەوە بۆ سەردانی گوندی بێوریێ "هەواری خاڵی"، بایەقوژو کونەپەپو تێیدا دەخوێند، پیاوی بە جەرگ سامی دەکرد، هەروەکو سەدساڵ بێ چۆڵکرابێ، ئەو

مریشك و باڵندەو ئاژەڵە ماڵیانەی بە جێمابوون ڕەنگی کێویلەیان لێنیشتبوو، هەر کەسێکیان ببیبنیایە چنگ لەسەرشان ڕایان دەکرد، هەروەکو دڕندەیان بینیبێت، بە هەرحاڵ ناتوانم بە تەواوی هەست و نەستی خۆم و ئەوەی بەچاو بینیم و لەدڵمدایە بۆتانی بەیان بکەم.

کاتێك سەیری ئەو ناودێ و باخ و باخاتەت دەکرد سامدەیگرتیت، جاران قەرەباڵغ و لە بن هەموو کەپرو ساباتێکدا گیزەی سەماوەرو فەرموو فەرموی پیاوماقوڵان و خزمان بوو، دەنگی ناسك و زوڵاڵی مناڵەساواکان و قوقەی کەڵەشێرو باڕەی بەرخ و کارژۆڵەو بزن و مەڕت دەهاتە گوێت، ئێستاش چۆڵ و هۆڵ، دەنگێك ئەبیستی گوێت دەزرنگێتەوە، بە ئاشکرا واهەست دەکەیت نەمام و درەختەکان بەخێرهاتنت دەکەن و داوای هەڵدانەوەی جۆگەلەو خێراوەکانت لێدەکەن، بە زمانی حاڵیان پێت دەڵێن بۆ جێتهێشتین؟ خۆ ئێمە چاومان لە دەست و مەچەك و پاچ و بێڵەکەی تۆ بوو، ئەوە بۆ ئاوا بێ وەفایانەو بە بێدەنگ و سەنگ بە جێتهێشتین؟ ئەو هەموو عیشق و خۆشەویستیەی نێوانمان چی لێهات؟ لە بیرت چوو کاتێك دارو بەردیشت تێبگرتینایە ئێمە میوەمان بەسەردا دەباراندی.! زۆر دەردە دڵی تریش، کە گریان قورگی گرتوم و ناتوانم لەوە زیاترتان بۆ بگێڕمەوە.

هەرچۆنێك بێت وتم: هەروەك هاتووم سەرێك لە دەوروبەری ئاواییش بدەم باشە، زۆر نەڕۆیشتم گوێدرێژە بەوەفاکەم هات بەرەوپیرم، سوێندتان لەسەرم نیە کە گەیشتە نزیك من و بۆنی پێوە کردم هۆن هۆن فرمێسك بە چاوەکانیدا هاتەخوارەوە! منیش خۆم پێنەگیرا دەستم کرد

به گریان، وتم: یارەبی خوا بەدکارو دوژمنی دین و خاك و ولآتمان بگرێت! بەخوا من هیچ دەسەلآتم نیە، لەزمانحالّی گوێدرێژە بەستەزمانەکە ئەوەم دەخوێندەوە کە دەلیّ: خۆزگە چۆلّتان نەکردایە، ئیتر بامنیش هەر ماندوبومایەو شەووڕۆژو چوار وەرزە هەر بارکێشیك بومایە[1]

## نیازپاکی کار لە ئاوی ژێرزەویش دەکات

خوای گەورە کاتێك بەهرەیەك بە کەسێك دەبەخشێت دوای ئەوە چاودێری دەکات، ئەگەر ئەو کەسە ئەو بەهرەی باش بەکارهێناو سوپاسی خوای لەسەر کردو شوێنەواری ئەو بەهرەو بەخششە خواییەی پێوەدەرکەوت و زانی چۆن بەکاری بێنێت، خواش بۆی بەردەوام دەکات و بۆی زیاد دەکات و پڕ فەڕو پیرۆزی دەکات. بەلآم ئەگەر سوپاسی خوای لەسەر نەکردو نەیزانی لە شوێنی خۆیدا بە باشی بەکاری بهێنێت، خوا لێی دەسیتێنێتەوە، یان دەیبەخشێتە کەسێکیتر کە شایستەترە.

(وەستا تۆفیقی ڕەشەعەوێن) خەڵکی گوندی گردەزوبێری شاربازێڕ وتی: پیاوێکی خەڵکی گوندی خۆمان کانی و بەرئاوێکی زۆر چاك و بە پیتی هەبوو، ئاوی کانیەکە ئەوەندە پڕپیت و بەرەکەت بوو لەسەروبەری ملك و باخەکەی زیادبوو، بەشی باڵندەو گیانلەبەری کێویشی دەکرد، ڕێبوارو خەڵکی گوندی و دەرودراوسێش لێیان دەخواردەوەو بۆ دەستنوێژو پێویستی خۆیان سوودیان لێدەبینی.

---

[1] بە دەستکارییەوە لە زمانی مامۆستا مەلا عەزیزی بێوریّ وەرگیراوە .

بەڵام تەماعی دونیاو بەرچاوتەنگی و تێرنەخواردن وای لە خاوەنی کانی و باخ و بەراوەکە کرد، ئاوەکە داپۆشێ و ڕێگەی خێرو خێراتی لێبگرێ، بۆیە دەورووبەرو سەری جۆگاکەی پەرژین کردو بە چقڵەزی و هەژەگەڵا ڕێگەی ئاوەکەی بڕی، منیش زۆرم ئامۆژگاری کردو هەزارویەك قسەم لەتۆ کرد، بەڵام نەیبیست، وتی: کاکە من ئاوو کانیاوی خۆمە، نایەڵم کەس دەمی لێ تەڕکا، ئیتر وازم لێ بێنەو لەوە زیاتر خۆتم لێ مەکەرە موحامی، بە هەرحاڵ دەستی بەسەر ئاوەکەدا گرت، ئیتر لەوەودوا نەئادەمی و نەخزم و بێگانەو نەخەڵکی ئاوایی و ڕێبوارو نەگیانلەبەرو باڵندەو ئاژەڵ، نەیاندەتوانی نزیك ببنەوە لەو کانی وئاوە، هەموو ئەو ئاوە سازگار و بەهرە خواییەیان لێ یاساغ کرا .

زەویە وشك و بێ ئاوەکەی ئێمەش لەگەڵ کانیاوو بەرئاوەکەی حاجی (...) دا گردێکی بەین بوو، ئەم دیوی گردەکە زەوی و موڵکی ئێمە بوو بێئاوو وشك و دێم بوو، ئەو دیو گردەکەش کە موڵکی حاجی (...) بوو خوا کانیەکی زوڵاڵ و سازگاری پێ بەخشیبوو، بەڵام نەیدەزانی خزمەتی خۆی پێ بکات و سوپاسی خوای لەسەر بکات.

ساڵ هات و ساڵ ڕۆیشت، دەستکرا بەڕێگەخۆشکردن و جادەلێدان، دەبوو جادەکەش هەر بەسەر ئەو گردەدا تێپەڕێت کە لە نێوان موڵکی ئێمەو حاجیدا بوو، بۆیە هەر کە شۆفڵ دەمی لە گردەکە گیرکردو دەستیکرد بە تەختکردنی سنگی گردەکەو جادەلێدان، کانیە سازگارەکە ڕێرەوی خۆی گۆڕی "یان بڵێین ڕێرەوی پێ گۆڕدرا"و ڕووی لە دیوی موڵکی ئێمە کرد، هەر بۆ بەیانی کە چوینە سەرکانیەکە لەم دیوی گردەکە

و لەسەروی زەویەکەی ئێمە سەری هەڵدابوو، ئاوێکی زوڵاڵ و ساردو سازگار گزنگی خۆر لێی دابوو، لە زەویەکەی ئێمەدا وەکو دوڕڕو یاقوت و دانەی گەوهەر دەبریسکایەوە.

لە گەڵ سوپاس و ستایشی ئێمەو شوکرانەبژێری ئێمە، لەو دیوی گردەکە گلەیی و گازندەو پەشیمانی حاجی (...) دەبیسترا: ئێستا من چی بکەم؟ چۆن ئەم ئاوەی من ڕووی لەو دیوو کردوە؟ بۆ دەماری ئاوەکەتان جوڵاندوە؟ من جادەم بۆ چیە؟ چۆن دارو درەختەکەم ئاو بدەم؟ ئەی خوایە چیم بە خۆم کرد؟

بەڵام تازە حاجی (...) دەستی لەبنی هەمانەوە دەرچوو، ئێستاو ئێستاش ئاوەکە جارێکی تر ڕوی لە حاجی و لە باخەکەی نەکردەوەو دەنگی لێ دابڕی و ڕوی لێ وەرگێڕا.

بەڵام ئیمە شوکرانەی خوامان لەسەرکرد، بەڵێنماندا ئەم کانیاوە خێرە، بەشی هەموو مرۆڤ و گیاندارو گیانلەبەرو باڵندەو زیندەوەرو مارو مێرو بێت، ئێمە خۆمان نەکەینە خاوەنی و لە ئاستی هیچ کەس و گیانلەبەرێکدا خاوەنی نەبین.

ئیتر حاجی (...)ش هەر ئەوەندەی بە دەستەوە مابوو وەکو خەڵکی گوند یان وەکو ڕێبوارێك بێتە سەر کانیەکەو پێویستی خۆی جێبەجێ بکات و ئاخ و داخێك هەڵبڕێژێت و بڕوات.

پێغەمبەر (ﷺ) جوان دەفەرموێت: (**المال مال الله والعباد عباد الله**)، یەکێك لە زانایان چووە لای کابرایەك کە ماڵێکی زۆری لە دەستدابوو، خەریك بوو لە غەمی ئەو ماڵەدا شێت ئەبوو، زاناکە پێی وت: (**یا عبدالله! إن المال مال الله، متعك به إن شاء، وأخذه منك إن شاء، فاصبر لأمره ولا**

**تجزع، فإن من تمام شكرالله على العافية الصبر له على المصيبة، ومن قدم وجد، ومن أخر ندم)**[1]، واتە: ئەی بەندەی خودا! ماڵ وسامان هی خودایە، ئەگەر ویستی پێت دەبەخشێ و ئەگەر بیەوێت لێتدەستێنێتەوە، ئارامگربە بۆ فەرمانی خودا وخۆت تێك مەدە، چونکە شوکرانەبژێری تەواو ئەوەیە چۆن لە کاتی خۆشیدا شوکری خودا دەکەیت لە کاتی بەلادا ئارامگر بیت، هەرچیت پێشنر بەخشیبێت لای خودا دەستت دەکەوێتەوە، ئەوەش کە دواتخستووە، بۆی پەشیماندەبیتەوە، پەشیمانیش بێسوودە .

## پاداشتی خوا گەورەترە

باوکی ڕەحمەتیم لە گوندی ڕەشان[2] مەلا بوو، گوندی کورە مێوە دراوسێ دێمان بوو، بە هۆی دراوسێیەتی و شیرخواردنەوە تێکەڵیمان زۆر بوو، بەتایبەتیش لە گەڵ ماڵی کاك فایەق حەمەصاڵح کە پیاوێکی زۆر خواناس و لەخواترس بوو، دراوسێیەکی چاك و بەوەفاش بوو بۆ هەمووان.

مامۆستا سیدعلی وتی: ڕۆژێك کاك فایەق خۆی کرد بە ژوورا، ماڵی ئێمەو ئەوانیش یەك ماڵ بووین، ئێمەو ئێوەمان زۆر لە نێواندا نەبوو، دوای ئەوەی پشوویەکی کورتی دا، وتی: مامۆستا لەکاتی ڕاکردن و

---

[1] کتێبی (شعب الإيمان)ی ئیمامی بەیهەقی، (**فصل في ذكر ما جاء في الأوجاع والأمراض**).

[2] لە زاری مامۆستا (سید علی عبدالواحد)، وتارخوێنی (مزگەوتی شێخ عبدالقادری چویسە)و پێش نوێژ لە مزگەوتی عثمان ئاغا لە سلێمانی .

ئاوارەییەکەیدا "ساڵی ۱۹۹۱" منیش ماڵ و خێزانم پێش خۆمدا بەرەو سیدصادق و لەوێشەوە بۆ پێنجوێن، لە بەینی عەربەت و کانی پانکەدا قەرەباڵغی و بگرەو بەردەیەکی زۆر لەسەر رێگاکە هەبوو، لەو کاتەدا پارچە شتێکی گەورە لەبەرپێمدا کەوتبوو، کە دەستم دایە مەنجەڵێکی گەورەبوو. جوان پێچرابووەوە، منیش وامزانی نانەوردەیە، کردمەوە کە سەیرم کرد هەمووی بیست و پێنجی پارەی عێراقی ئەو سەردەمەبوو.

بە خۆمم وت: چاك توشبووم، هەڵینەگرم و بفەوتێ و گوناهبار دەبم، هەڵیدەگرم چی لێبکەم و لە کوێ داینێم، ئێمە بەم هەموو ترس و لەرزو ئاوارەیی و بێ نەواییەوە خوایە چی لێبکەم، ناچار خێزان و ماڵم ئیزندا، وتم: ئێوە برۆن من دەچمەوە بۆ باریکە "ئۆردوگای باریکە"، بەڵێ مەنجەڵە پێچراوەکەم هەڵگرت و هاتمەوە بۆ باریکە، واتە بەرەو مەرگ، چونکە دەیانوت: سوپای حکومەت بەرێوەیەو تەرو وشك بە جارێك دەسوتێنێت. کە گەیشتمەوە ماڵەوە، ماڵی چی؟ چۆڵ و ئۆردوگای وێران و تاریك و کپ و بێدەنگ، هەر ئەو شەوە لە حەوشەکەی خۆماندا چاڵێکم هەڵکەندو مەنجەڵە پارەکەم تێدا شاردەوە، بەشێوەیەکی وا شاردمەوە ترسام خۆشم باش نەچمەوەسەری. بەڵام پێش لە چاڵنانی بژاردم ۱۹۵ هەزار بوو.

پاش ماوەیەك خێزان گەڕانەوەو منیش لای کەس باسمنەکرد، زۆریش ئەترسام شتێکم لێ بێت و پارەکە بفەوتێ، خێزانی خۆشمان وتی وتیەکیان تێکەوتبوو، هەستیان بەوە کردبوو کە پارەیەکم دۆزیوەتەوە – هەر بەگومان– ئەگەر نا دڵنیا نەبوون، بۆیە زۆر داوایان لێکردم دەهەزار

دیناریان بدەمێ کە کوڕەکان کاری پێبکەن و دواتر کە قازانجیان کرد بمدەنەوە، منیش خۆم لێ هەڵە کردن و نەمدانێ.

لەو سەردەمەدا کاك تۆفیق هات بۆ سەردانم، وتی: فلاّنی من ئەوەندە پارەم دۆزیوەتەوە بە ئەمانەت بە تۆ دەڵێم، ئەگەر مردم با جەنابت بزانی، چونکە من چەند ساڵێ لەبەغدا بووم، دەچم بەڵکو لەوێ کارێکم دەستکەوێ، ئێستا لێرە نەبوونی و بێکاریە، سەردەم سەردەمی کەپرە برنجەو گرانیە.

بەڵێ سواری پاسێکی بیستویەك نەفەری دەبێت، لە بازگەیەك "سەیتەرە" بەبێ لێپرسین هەموویان دەگرن، کاك فایەقیش وەکو دواتر بۆی گێڕامەوە وتی: ئەوەندەی خەمی پارەکەم بوو ئەوەندە خەمی گرتن و ماڵ و خێزانی خۆشم نەبووم.

بە بەندکراوی بردیانین بۆ کەرکوك، زۆر بەبێ ویژدانی لێیاندابین، دواتر هەر دوان و سیان فڕێیان داینە ژوورێکەوەو بەسەر ژوورەکاندا دابەشیانکردین، کە پڕبوون لە بەندکراو. ئەو ژوورەی منیان تێکرد پیاوێکی لێبوو، زۆر ڕوگرژو خەفەتباربوو، ویستم لێی بپرسم بۆ غەمبارەو هەندێ ئامۆژگاری بکەم و دڵخۆشی بدەمەوە، لەکاتی دەستنوێژدا یەك دوو قسەم لەگەڵ کرد، پاسەوانەچەتەوڵەکە تێیخوڕین و وتی: کورد ئەوەندە موسڵمانە وا دەستنوێژ دەگرن؟ ئیتر لێمان توڕە بوو نەیهێشت قسەکانمان بە ئەنجام بگەیەنین، بەلاّم سەرەمویەکم دەستکەوت، ئەوەندە فریاکەوتین وتی: ناوم جەبارەو دووبرام ئەنفالن و ژن و منالّی ئەو دوو برایەم بەسەرمدا بەجێماون، تەنها" دەراسەیەك "کەمپاینێکیان هەبوو،

بۆم فرۆشتن بەڵکو لەم گرانیە پێی دەرباز بن، براژنە بێوەژن و منداڵە هەتیوەکانیان ئیحتیاجی دەستی خەڵکی نەبن، بەڵام ئیتر دڵی پڕبوو، وتی: پارەی کەمپاینەکە ١٩٥ (سەدو نەودو پێنج هەزار) بوو، لە شڵەژاوی و شپرزەیی خۆمان لە ڕێگەی سیدصادق لێمان ون بوو. وتم: خوا گەورەیە خەمت نەبێ، إنشاءالله ئەیدۆزیتەوە، برا خۆخەڵکی ئەم وڵاتە زۆربەی هەرە زۆری حەلاڵخۆرو چاکەخوازە، بەڵکو دەست کەسێکی باش بکەوێت بۆتان بێنێتەوە.

ئیتر منیش دڵمخۆش بوو سەرەداوێکم دەستکەوت، لە خۆشیا دوو سێ جار خەریك بوو پێی بڵێم کە پارەکە لای منە، بەڵام دانم بەخۆمدا گرت هەتا ڕۆژی دواتر، وتیان: ئەرێ وەڵا ئەوە (شێخ طاهری چوێسە) هات، کیتابی پێیە خزم و بارو شتومەکیان گیراوە، هاتووە بەڕەڵلایان کات، (شێخ طاهر) بە عەبایەکی عەرەبیەوەو بە هەیبەت و بەژن و باڵاو ڕواڵەتێکی جوان خۆی کرد بە ژوراو قسەی لەگەڵ ئەفسەرەکان کرد، یەکسەر ئەفسەرێك وتی: کێ جەماعەتی (شێخ طاهرە) بابێ ناوی خۆی بنوسێ، من یەکەم کەس چوم ناوم نوسی، شێخ وتی: کوا تۆ جەماعەتی ئێمەی؟ وتم: قوربان باوکم چەند ساڵ درویش و موریدی جەنابی باوکتە، وتی: باشە یەکەم ناو ناویان نوسیم، کە لە ناونوسین بونەوە، وتیان: بڕۆنەوە ژورەوە دوو ڕۆژی تر ئازاد دەبن، ئیتر گەڕامەوە ژورەوە، ناوو ناونیشانی تەواوم لە کاك جەبار وەرگرت، وتم: من هەواڵێکی ئەو پارەیە دەزانم بە دوایدا دەچم، واز ناهێنم خەمت نەبێ، بەڵام نەموت: لای خۆمە،

ئەوەك خوا بەڵایەكی بۆ ناردبێ، وتی: براژنەكەم و منداڵە بێباوكەكانیان لە هەولێرن و لە فلان گەڕەكن.

دوای دوو ڕۆژ من ئازاد بووم، بە گەیشتنی ماڵەوە ڕۆیشتم بۆ هەولێرو دوماڵە هەتیوبارەكەم دۆزیەوە، زۆر كەساس و داماوو هەژار بوون، وتم: من لەلایەن مامەجەبارەوە هاتوم، إنشاءالله ئەویش بەرەڵلا دەبێ، ئێوە شتێكی ئاواتان لێ ڕوودراوەو پارەیەكی ئاواتان لێ ونبووە؟ وتیان: بەڵێ، وتم: لای منەو خەمتان نەبێ، لەخۆشیا هەندێكیان دەستیان كرد بەگریان، ژنی برا گەورەكەیان وتی: ئەوە بەگەردن ئازادی (١٥) "پانزە هەزار دیناری"[1] بۆ خۆت، وتم: خوشكم ئێوە چاكە لەگەڵ من ناكەن من خێری قیامەتم دەوێ، خۆ ١٩٥ "سەدو نەوەد و پێنج" هەزار دینارەكە زۆرتر بوو ئەگەر لە بەر خوا نەبوایە ومەبەستم پارە بوایە، بەخوا یەك فلستان لێوەرناگرم.

چەند كەسێكیان لەگەڵ خۆیان هێناو بە ئاگاداری و ئیمزاو شاهیدی من "مامۆستا سید علی"و "مامۆستا مەلا محمد"ی كانی مانگا پارەكەمان تەسلیم كردنەوە، نوسراوەكە ئێستاش هەر ماوە لە لام.

كاك فایەق لە گەڕەكی شێخ عەباس لە سلێمانی دوكانی دانابوو، ڕۆژێكیان پاسێك خۆی دەكات بە دوكانەكەیداو لێی ئەدات، بردیانە نەخۆشخانەو لەسەرەمەرگدا من فریای كەوتم، وتی: دوای خۆم بیانو بەم سایەقە مەگرن، ئەوا لە بەرخوا گەردنم ئازاد كرد، چونكە من دەمرم دوای من لەوانەیە لێی نەبوورن، ئەوا خۆم لەبەرخوا بەخشیم، لە قسەكانی

---

[1] ئەو دەمە (پانزە هەزار) دووخانوی باشی پێدەكرا.

بوەوەو دوای ماوەیەکی کەم بەدەم وەسیەت و گەردن ئازادیەوە گیانی سپارد .

مامۆستا سیدعەلی دەڵێ: لە کۆتا ڕۆژی پرسەکەیداو لە وتاری کۆتایی پرسەکەدا، ئەم بەسەرهاتی پارە دۆزینەوەیەم بۆ خەڵکەکە گێڕایەوە، هەستی خەڵکی زۆر ورووژاندو دوعای خێریان بۆ کرد، کوڕەکانیشی کاك"نجم الدین و بهاءالدین و فەرید"بەم هەڵوێست و مردن و بەخشینەی باوکیان زۆر سەربەرز بوون.

**چاوەڕانی بەرگی سێ یەم بن انشاءالله**

# پێرستی بابەتەکان